پرۆژەی چاپ و بڵاوکردنەوەی دیکۆمێنت و بەیاننامەکانی
حزبی سۆسیالیستی کوردستان (١٩٧٦-١٩٩٣)
زنجیرە: (١)

* بۆ ئەوەی ڕاستیەکان لە جەماوەر وون نەبن
* لە بڵاوکراوەکانی حزبی سۆسیالیستی کوردستانی عێراق
* ئامادەکردن و دووبارە چاپ کردنەوە: ئیسماعیل تەنیا
* چاپی دووەم - ٢٠١٩.
* بلاوکردنەوەی سنووردارە.

# ورده ڕاز و دەردە دڵ
## (١)

شـــتێکی تـــازە و نهێنیـــیەکم نەدرکانـــدوە ئەگەر بڵـــێم: لە هەمـــوو قۆناغەکـــانی ژیـــانی مرۆڤایەتیـــدا مێـــژوو لە لایەن ســـەرکردە و ڕێـــبەر و دەسەڵاتدار و نەتەوە سەردەستەکاندا، نووسراوەتەوە... چییـان پـێ خـۆش و بـاش بـوو بێـت و زیـانی بەر بەرژەوەنـدییەکانیان نەگەیانـدبێت، ئەوەیـان نووسیوەتەوە... دوور نەڕۆیـن، سەدام حوسێن ڕێبەر و سەرکردەیەکی دڵ ڕەق و زەبـر وەشـێن بـوو، لەوانەیە بەلای هەنـدێک عەرەب و موسـڵمانی غەیـرە عەرەب سـەرکردە و موجاهیـد بـوو بێـت، بەڵام هەرگیـز بیرمەنـد و فەیلەسوف نەبووە!! ئەو ڕۆژانەی سەدام لە هەڕەتـی دەسـەڵات و گـوڕاح خۆشیدا بوو، بە زەبری پارە سەدان نووسەرو ڕۆژنامەنووسی نەفس نزمـی عەرەب و غەیـرە عەرەبـی، ڕامکردبـوو... ئەو نووســەرانە، بە تـایبەتیش (ئەمیر ئەسکەندەر)ی میسری بە ئایین مەسیحی و (کەریم بقرادۆنـی) ئەرمەنـی لوبنـانی و تـاد، چەندین کتێبی قەبە و بارستایی قورسیان لەســەر نووســی و چ لەقەبـی وەک: (مـــوفەکیر، قائیـــد، مجاهیـــد، فەیلەسوف، ڕۆحی نەتەوە، قائید ئومە، قائیدی زەرورە، ... )یان دەقەبەر کـرد... کە سـەیری کـردەی جەسـەدی و مەعنەویشـی دەکەیـن، نـاوبراو، هـــیچ یەکێـــک لەم لەقەب و ســـیفاتانەی نەبـــووە... ئەگەر ئـــێمەش بەم پیاهەڵدانەی بـاوەڕ نەکەیـن، نەوەی دوای ئـێمە، بە تـایبەتی ئەوانەی لە ڕووی جوگرافیـاوە لە عێراق دوورن، سـەیری مێـژوو دەکەن و دیکۆمێنـت دەخوێننەوە، نەک هەر باوەڕ دەکەن، بەڵکو دەشی پەرستن... ئەو نووسین و کتێبـــانە چـــوونە نـــاو قەفەکـــانی مێـــژووەوە، ئەگەر بەلای هەنـــدێک توێژەرەوە جێگای بایەخ و ئاوڕدانەوە نەبێت، ئەوا دڵنیـام لای بەشێکی تـر دەبنە سەرچاوەی بە بایەخ و موعتەبەر.

## (٢)

مێـــژووی خۆمـــان، ئەو بەشـــە کەمەی کە نووســـراوەتەوە، یـــان نەیارەکانمان، یان میرزای دیوەخانی میرەکانمان نووسیویانەتەوە... ئەوەی دڵی میری خۆش کردووە، یاداشت کراوە، ئەوەی سەرو دڵی پێ گیراوە، تورڕ دراوەو خۆی لێ بە خاوەن نەکراوە... ئەوە نەک بۆ مێژووی دووری تەمەن چەند سەد ساڵێک ڕاستە، بەڵکو بۆ مێژووی نزیکی (٣٠-٤٠) ساڵی ڕابردووشمان وەک: (کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگە شەوە).

ئـــاخر ســـەرکردەو ڕێـــبەری وامـــان هەبـــوو نەک هەر بە قســـەی نەیارەکانیان، بەڵکو بە دانپیانانی هاوڕێ و هاوسەنگەرە نزیکەکانیشیان، هەر یەک ڕوخساری سپی و پاک و گەشیان نەبووە، لەپاڵ ئەوەشدا، دیـــوێکی ئەرژەنـــگ و ڕەشیشـــیان هەبـــووە... کەچـــی کە لەناومانـــدا ژیانئاوایی دەکەن و بە (بای بای) یەکجارەکی بەجێمان دەهێڵن، چی پەیڤی نەرم، جوان، ئینسان دۆستی و ڕەونەقدارە، بە باڵایان دادەبڕین، وەک ئەوەی وا بێت کە کابرای ژیانئاوایی کردە مەڕێکی لە ئاو نەکردبێت، یان چۆلەکەیەکی سەر نەبڕی بوو بێت!!

ئەوەیە مێژوو... !!

## (٣)

حەز بکەیـن یـان نـا، پێمـان خـۆش بێت یـان نـا، حـزب و گـرووپ و ڕێکخراوە سیاسییەکانی لەمەڕ خۆمان، مەبەستم لەم چوارچێوە (١٩٧٥-١٩٩١) زەمەنییەیە، بە کردەو بردەی باش و خراپیانەوە، بوونەتە بەشێک لە مێژووی نەتەوەکەمان... ئەگەر بە دڵ و حەزی هەندێکیشمان نەبێت، بە لای بەشێکی ترەوە، مێژووی ڕەونەقداریان نەخشاندووە. ئەوەی ئەمڕۆ (لە سـەرچاوەو دیکۆمێنـت و بەڵگەنامەکـان)ەوە، دەیـانخوێنینەوەو دەیـان بیسـتین، ئەویـش زێتـر هەر هـی ئەو لایەنـانەیە کە ئەمـڕۆ (گۆ)یـان لە مەیدانەو (نان)یان لە خوانە... ئەوانـی تـر بـوونەتە ئاردی نـاو دڕکـان و مێوژی سەر بوکێ... یان ئەوەی هەشیان بووەو هەندێکیان لەملاو لەولا

دەست دەکەون، کەوتوونەتە دەست بابایەکی چاو تەنگ و پووش بەسەر کراون... خەڵکانێک هەن حەز بە خستنەڕوو و هەڵدانەوەشیان ناکەن، چونکە ئەمڕۆکە نانیان کەوتۆتە دەست لایەنی نەیار... ئێ چی بکەین، خاوەنی دیکۆمێنتی پووش بەسەر، ئەوانیش لەوان ڕۆژان و قۆناغەدا، (گۆ)یان لە مەیدان و، (نان)یان لە خوان بووە... بۆ دەبێت ئەمڕۆکە لە بەرامبەر (نان) لە خوان و (گۆ) لە مەیدانان، قڕو قەپ و (گەنم گورزە و جۆ بڵاو)ی لێ بکرێت؟!

ئەو دیکۆمێنت و بەیاننامەو ئەرشیفەی ئەمڕۆ لەبەر دەستی توێژەران دایە، هەر هی ئەوانەیە کە ئەمڕۆکە خۆیان بە خاوەن و دروست کەری ئەو مێژووە دەزانن... واتە: هەر لایەنی یەکەمی قسەکەر دەبینین و لایەنی بەرامبەرو گوێگرو خاوەن وەڵام ونە... تاکە هۆکاریش بۆ ئەم (ون) بوونە لای من بۆ نەبوونی دیکۆمێنت و ئەرشیف دەگەڕێتەوە....

## (٤)

زۆر جاران، بە تایبەتیش لە سەرەتای ساڵانی دوو هەزارەکاندا، لە کۆڕو دانیشتنی دکتۆر (مارف خەزنەدار) دەمبیست و دەیگوت: (خانەوادە و کەس و کاری خۆم وا دەرس داداوە کە یەک پەڕە کاغەزی نووسراو نەفەوتێنن... ئەو پەڕە نووسراوەی ئەمڕۆ لای ئێمە بێ بایەخە، پاش تێپەڕ بوونی چەندین ساڵ، دەبێتە دیکۆمێنت و سەلمێنەری ڕاستییە مێژووییەکان).

دیارە ئەم بۆچوون و هەڵوێست وەرگرتنەی د. مارف، لە کۆنیشدا هەر وا بووە... (حوسێن عارف)ی بەغدا نشین ساڵی (١٩٧٤) کە تازە چەند مانگێک دەبوو کوردو سەرکردایەتییەکەی لە بەرامبەر بەجێ نەهێنانی بڕیارەکانی لەمەڕ بەیانی یازدەی ئازاری ١٩٧٠، دابوویانە شاخ، ئەویش ناچار دەبێت خۆی کۆ بکاتەوەو بەغدا جێ بهێڵێت و بداتە شاخ... بۆ ئەم مەبەستە، دوای (بژار کردن)، بەرهەم و دەستنووسەکانی خۆی، بۆ ئەوەی لە جێگایەکی ئەمین دابێت و نەفەوتێن، تەسلیمی (د.مارف)ی

دەکات و پێشی دەڵێت: (چی جێگای مەترسییە بۆ ئێوەو کتێبخانەکەتان، ئەوا لەناویان دەبەم.... ). دکتۆریش لە وەڵامدا دەڵێت: (قبوڵ ناکەم یەک پەڕە کاغەزیش لەناو ببەیت و بیان سووتێنی...). ئەوەیە ئەرشیف دۆستی و قەدر زانینی دیکۆمێنت...

پێچەوانەی ئەم هەڵوێستەی د. مارف، خەڵکی واش هەیە قەدری ئەم پەڕە کاغەزانە نازانێت، لە بچووکترین مەترسیدا، ئامادەیە بیانسووتێنێ و زیندە بەچاڵیان بکات... دڵنیام زۆر بەیاننامەو هەڵوێست و دیکۆمێنتی مێژوویی هەبووە، کەوتۆتە لای هەندێک کەس و بەبێ نرخ و پێزانینەوە، فەوتێندراون، یان تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، پووش بەسەر کراون. ڕاگواستن و گوند سووتان و ئەنفال و زەبرو زەنگی ڕژێم، گورزێکی کوشندەی لەم بوارە داوە... خەڵک هەبووە بە گونیە دیکۆمێنت و بڵاوکراوەی هەبووە کەچی لە بڕیارێکی کتوپڕ و لە یەک چرکە ساتدا، هەمووی کردۆتە خۆڵەمێش... گەر ئەوانە بێنە قسە، لە چوارچێوەی ئەم زەمەنەدا، لەوانەیە لەسەر هەقیش بوو بن...!!

## (٥)

بڕیارم داوە (ئەوەندەی دەستم دەکەوێت) و بۆم دەلوێت، (بەیاننامە، بڵاوکراوە، بەلاغی عەسکەری، دیکۆمێنت)ەکانی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان/عێراق ١٩٧٦-١٩٩٣)، بە زنجیرە، ئەگەر بە تیراژێکی کەم و سنووورداریش بێت، دووبارە چاپیان بکەمەوە... بۆیە لێرەدا بانگی ئەوانە دەکەم کە شتێکیان لەم بابەتە لایە، ئەگەر دانەی ئۆرگیناڵیشم پێ نادەن، ئەوا دانەیەکی کۆپی کراوم بخەنە بەر دەست، بە دڵنیاییەوە، لە کاتی چاپکردنەوەی ئاماژە بە ناوو یارمەتییەکانیان دەکرێت... لەم کارەمدا، مەبەستیشم ئەوە نییە کە لە کێشەو بینەو بەردەکانی ئەم قۆناغە، ئەوان هەقدار بناسێنم... نا، ئەوە ئیشی من نییە، توێژەران دەتوانن ئەمە یەکلا بکەنەوە... تاکە مەبەستم ئەوەیە لە تاو و توێ کردنی مێژووی ئەم قۆناغەدا، دیکۆمێنت و قسەی ئەوانیش لەبەر دەستی توێژەر و قوتابیانی

بەشی مێژوودا بێت، تاوەکو ئاسانتر و مەنتیقی تر کێشەو ململانێکان، یەکلا بکەنەوەو گوێشیان لەوانە بێت کە لەوان ڕۆژان لایەنێکی ململانێکان بووینەو ئەمڕۆ قسەکانیان لە مەیداندا نین...

**(٦)**

لە دەستپێکی ئەم پڕۆژەیەدا، بەیانێکی دوورو درێژی (مەکتەبی سیاسی حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، بڵاو دەکەمەوە کە کاتی خۆی (لە **١٩٨٣/٢/٦**)، لە شێوەی ناملکەیەکی (**٣٨**) لاپەڕەی قەبارە زەنگیانە کتێب (ئەی ٦)، بە ناوونیشانی (بۆ ئەوەی ڕاستیەکان لە جەماوەر وون نەبن) بڵاو کردۆتەوە... ئەم بەیاننامە وەڵامێک بووە بۆ بەیانێکی (کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)، کە لە ڕۆژی **١٩٨٣/٢/٤**دا، لە ئیستگەکەیانەوە (ئیستگەی دەنگی شۆڕشی عێراق)، بڵاوکراوەتەوە.

من تەواوی بەیاننامەکەم وەک خۆی، بە هەمان شێوەو ڕێنووسەوە (کە بەلای منەوە لە ڕووی ڕێنووسەوە هەڵەشی تێدایە)، نووسیوەتەوە.

**ئیسماعیل تەنیا**
**کانوونی دووەمی ٢٠١٩**
**هانۆڤەر**

# بۆ ئەوەی ڕاستیەکان لە جەماوەر وون نەبن

لە ڕۆژی ١٩٨٣/٢/٤دا بەیانێکی کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە ئیستگەکەیانەوە بڵاوکرایەوە، کە تیایدا باسی چەند ڕوداوێک دەکەن لە زنجیرەی ئەو کۆمەڵە ڕوداوانەی کە لە نێوان هێزەکانی حزبمان و هێزەکانی جود لە لایەک وە هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی لە لایەکی تر قەوماون. لەوەتای شەڕی برا کوژی ساڵی پاری نێوان یەکیەتی و لایەنەکانی تر وەستاوە تاوەکو ئیشتا.

برایانی یەکێتی نیشتیمانی وایان دەرخستووە کەوا هێزەکانی حزبمان لەو روداوانەدا دەست پێشکەر بون و شەڕیان فرۆشتووە پێیان و لێپرسراوانی حزبمان بە هەندێ دزو دەست ڕەش و تاقمی گومان لێکراو دەداتە قەڵەم و بو قسەی ئەوان هەوڵ دەدەن لە ڕێگای ڕوداوی دروست کراو بە پەڵپ و بیانوی ناڕاستەوە دیسان شەڕی برا کوژی هەڵگیرسێنن و جولانەوەی گەلەکەمان لە شاڕێی ئاسایی خۆی لابدەن و سەر لە نوێ کوردستان بکەنەوە مەیدانی کورد بە کورد بە کوشتدان.!! گوایە هێزەکانی ئەوان ئەگەرچی غەدریشیان لێکراوەو پەلامار دراون بەڵام لە پێناو پەکخستنی پلانی بە کوردی کردنی شەڕ دانیان بە خۆیاندا گرتوە و پەنایان نەبردۆتە بەر وەڵامدانەوەو بەکارهێنانی چەک و بگرە لێکۆڵینەوەو وتوویژی برایانەو دیموکراتیانەیان گرتۆتە بەر بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیستی کوردستان ئارەزوی جدیان پیشان نەداوەو ملیان نەداوەتە تەبایی و بە ناهەق لەسەر سیاسەتی شەڕ فرۆشتن و هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆیی بەردەوام بون... لە کۆتایی بەیانەکەدا لە کاتێکدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە ڕێگای جولاندنی عاتیفەی ساکاری چەکدارەکانیان بە ناوی دیفاعەوە هەوڵ دەدەن بۆ بەگژاچونی پێشمەرگە قارەمانەکانی حزبمان، لەهەمان کاتدا بۆ زیاتر شێواندنی ڕاستەقینەکان، ڕادەگەیەنن کەوا ئەمجارەش وەکو هەموو جارێک

یەکیەتی نیشتیمانی ئامادەیی تەواوی خۆی دەردەبڕی بۆ چارەسەر کردنی هەموو گیروگرفت و ناکۆکیەک لەگەڵ حزبی سۆسیالیست یان هەر هێزێکی کوردی تر بە ڕێگای سیاسی و گفتوگۆی هێمنانەو لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەی چەند قۆڵیەوە. هەروەها بانگەوازی جەماوەری کوردستان دەکەن کەوا زەخت لە حزبمان بکات بۆ ئەوەی لە جیاتی ڕێگای بەکارهێنانی چەک و کوشتن، ڕێگەی سیاسی و گفتوگۆی هێمنانە هەڵبژێرن بۆ چارەسەر کردنی کێشەو گیروگرفتەکان...

هاونیشتیمانیانی بەڕێز.. جەماوەری کوردستانی ڕاپەڕیو.. ئێوە زۆر باش دەزانن و لێتان ڕوونەو شاهیدی هەموو ڕوداوەکان بون.ئەم جارە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان چۆتە کەوڵی مەڕەوەو دەیانەوێ لە ڕێگای محکمەو پێ سەلماندنەوە گۆشتی مەڕەکە بخۆن. ئەم جارە لەژێر ناوی پەکخستنی شەڕی برا کوژی و کوردانی شەڕەکە دەیانەوێ پەلامار بدەن، بیانوو گۆڕاوە بەڵام مەبەست هەر وەکو خۆیەتی. ئێوە لاتان ڕوونەو ئاشکرایە کە حزبی سۆسیالیستی کوردستان تاکو ئێستا لە گەمارۆدان و هێرش و پڕدانە ئیعلامیەکانی بەردەوامی یەکێتی نیشتیمانی بێ دەنگ بوەو گوێی نەداوەتێ، ئەوەش بە گوێرەی تاکتیک و ڕێ و ڕەسمێکی تایبەتیەوە بوە کە بۆ یەکەم جار لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردمان پەیڕەوی کراوە. چونکە موهاتەرات و شەڕە قسەو تۆمەت و تاوان دانە پاڵ یەکتری لەنێوان باڵەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی لە ڕابردوو ئێستاش لە مەوقیعی جیاواز جیاوازەوە ئەوەندە نامەوزوعی و ناڕاست و کەم تەمەن بون نەک هەر مایەی قێزی خەڵکی کوردستان بون بەڵکو چەکێکی کاریگەری دەستی دوژمنان بوون بۆ ڕەش پیشاندانی سەروەریەکانیشمان.

حزبمان وەکو بڕوایەک بەو سەرەتایەی کە بواری ئەوەندە سەخت و دژوار دێنە کایەوە لەڕێڕەوی خەباتە نوێیەکەماندا، هەویەی هەموو حزبەکان و ڕادەی دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و ماهیەتی ڕاستەقینەیان بەتەواوی دەردەکەوێ و دەناسرێن ئەگەر دەیان هەویەی ساختەو شێوەی

ماکیاج و قیافەت بەکاربهێنن چونکە جەماوەری کوردستان ئەوەندە گوێی لە قسەی ڕێک و پێک و نەخشاو بوەو ئەوەندەی ڕەفتاری چەوت و چەوێڵە دیوە، هێندە یاری بە چارەنووس کراوەو پەنجەی کراوە بە زاخا ئیتر ئاسان نیە ئیعلام و ڕاگەیاندنی دیماگۆگیانە ڕاستیەکانی لێ وون بکات، تازە بڕوا بە هەموو قەوانێک و ئاوازێک ناکات، دۆست و دوژمنەکانی باش ناسیوە، هێزە شۆڕشگێڕو دڵسۆزەکانی باش ناسیوەو خەریکە زڕە شۆڕشگێڕو ڕابەرانی شۆڕشی چەواشەش دەناسی. جەماوەری کوردستان کە لەناو زەبرو زەنگ و کوشتن و بڕینی ڕژێمی فاشی دەست بەرداری ئامانجەکانی نابێت و قارەمانانە ڕادەپەڕی و بەگژ جەللادە پیاو کوژەکاندا دەچێتەوەو بەخوێنی گەش و ئاڵی شەقام و بازاڕەکانی شارو گوندەکانی دەنەخشێنێ و لەژێر باری ئیعلامی فاشیانە بەرچاو ڕوونانە سەر دەردەکات و پیلان و مانۆرەکانی ڕژێم ریسوا دەکات و ڕێگای خەبات بزر ناکات. خەڵکی کوردستان دیارە ڕۆژانە چەند جارێک سروشتی ئیعلامی ڕژێم دەبینن کاتێک کە هەواڵی ڕاپەڕین و خۆپیشاندانەکان کە دەیان ڕۆڵەی قارەمان تێدا شەهید دەبن کەچی بۆ ئێوارە لە ئیستگەی ڕژێمەوە دەبیستری کەوا جەماوەری قەڵادزە یان سلێمانی یان هەولێر ڕاپەڕیون و خۆپیشاندانیان کردوە بۆ پشتیوانی کردنی قادسیەی سەدام و موبایعە کردن بە خوێن بۆ سەرۆکی پێشەوا سەدام حسین. بەڵێ جەماوەری گەلەکەمان کە لە بۆتەی خەباتی سەختدا قاڵ بۆتەوەو سەلیقەی شۆڕشگێڕی بەو ئەندازە بەرز بۆتەوە بە کردارو هەڵوێستە شۆڕشگێڕیەکانەوە نەک بە ئیعلام و قسەی ڕەنگاوڕەنگ هەڵوێستی هێزە سیاسیەکان سەرنج دەداو هەڵی دەسەنگێنێ و ڕادەی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی هەر یەکەیان بۆ بەرژەوەندی بەرزی خەباتی گەلەکەمان تێدەگاو دروشمە ڕەسەنە نەگۆڕاوەکان لە دروشمە ساختەکان لەیەک جیا دەکاتەوە.

حزبمان هەر لەم سیقەو بڕوا بەرزە بەخۆی و بە جەماوەری گەلەکەمان خۆی بە ڕەتدانەوەی ئەم هەموو پڕوپاگەندەو تۆمەت و بوختانە

ئیعلامیانەی یەکێتی نیشتیمانی خەریک نەکردوە، کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ هیچ وشەو ڕستەیەکی ناحەزو دزێو نەماوە کە دژی حزبمان بەکاری نەهێنابی، هیچ تۆمەت و ناوو ناتۆرەی سیاسی و تەنانەت بازاڕیش نەماوە نەیان دابێتە پاڵ حزبمان، لە وتارەکانی ئیستگەکەیان و نوسین و بڵاوکراوەو نامیلکەکانیان و لە کۆڕو کۆبوونەوەو سیمینارەکانیان لەناو جەماوەرو لە ڕیزەکانی خۆیان و تەنانەت هەتا لەناو دۆستەکانی خەباتی گەلی کوردیشمان لە دەرەوەی وڵات.

کاتێک لە سەرەتای هەڵگیرسانەوەی شۆڕشە دیموکراتیە عێراقیەکەمان، حزبمان بۆ ڕابەری خەباتەکەمان بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی فاشی بەغدا و دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی لە عێراقدا داوای پێکهێنانی بەرەی نیشتیمانی عێراقی فراوان و بە عێراقی کردنی شۆڕشی دەکرد بە دەیان ڕاپۆرتیان لێ نوسین بۆ دۆستەکانی دەرەوەمان و بە ناهەق تۆمەتیان بۆ دروست کردین کە گوایە ئێمە هێزێکی نەتەوەیی تاکڕەوین و حەز ناکەین شۆڕشەکە ببێتە عێراقی..! کاتێک حزبمان دروشمی هاوپەیمانێتی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو حزبی شیوعی عێراقی بەرز کردەوە کەوتنە لێدانی قەوانی ئەوەی کە ئێمە بوینە شیوعی و پاشگری شیوعیەکان. کاتێک دژی شەڕی برا کوژی وەستاین و داوای یەکخستنی خەباتی هێزە کوردیەکانمان کرد... تاوانی هاوکاری پارتی و بە قسەی ئەوان قیادەی موەقەتەیان داینە پاڵ کەوا ئێمە هەوڵ دەدەین ئەوانە بێنەوە ڕیزی نیشتیمانی لە کاتێکدا کە ئەوان هێزێکی (کۆنەپەرست و خۆ فرۆشن).

کاتێک لەگەڵ حزبی شیوعی و پارتی بەرەی نیشتیمانی دیموکراتی عێراقی (جود)مان مۆر کرد کەوتنە پەلاماردان و بە دەستی (ڕیگان)ی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایان داینە قەڵەم. ئەوە هیچ خۆ دەیان جار بە پڕوپاگەندەو بە خەیاڵ حزبەکەمانیان لێک هەڵوەشاندەوەو دابەشیان کردوین. پاشان ئەوە بوو بە ناهەق و لە خوتوخۆڕایی شەڕی قەڵاچۆ کردن و پاکتاوکردنی عەسکەریان بەسەرماندا سەپاندو بەبێ

ئەوەی ئاگــادار بــین هەڵیــان کوتــایە ســەر بارەگاکانمــان و ڕۆڵە هەڵکەوتوەکـانی وەکـو شـەهید شـێرکۆ شـێخ علـی و عبـدالله سـور و مامۆستا شریف و مام ئاراس و حسن وەرتی و دەیان پێشمەرگە و کادریان لێ شەهید کردین بە ناوی میوانداری و بە غەدر. خۆ ئەو کاتەش هەر پیلانی کورداندنی شەڕمان نەدەگێڕا...!!

کاتێک لەگەڵ پارتی پێک هاتنەوەو ڕێکەوتنیان ئیمزا کرد ئەم جارە گوتیـان یەکێتـی نیشـتیمانی نـوێنەری کرێکـارانی کوردسـتانەو پـارتیش نـوێنەری بورجـوازی نیشـتیمانیە، ئیتـر پێویسـت ناکـات و نابێـت حزبـی سۆسیالیسـت و حزبـی شـیوعی و پاسـۆک بمێـنن و خانەیـان نـیەو دەیـان توێنینەوە.. لە هەموو ئەو تۆمەت و تاوانانەی دایانە پاڵمان هەموو جارێ خوێنمـان حەڵاڵ کـراوە خـۆ مەوزوعـی بەدنـاو کـردن وشـێواندنی ناوبـانگی شۆڕشگێری حزبمان و کەم کردنەوەی قورسایی و قەوارەو سەروەریەکانمان بە ڕادەیەک بوە هەتا شەهیدەکانیشمانی گرتۆتەوە.

کاتێـک لەلایەن پێشـمەرگە قارەمانەکانمـان چەنـد خەبیرێکـی بێگـانە کە بۆ پرۆژە سەربازیەکانی ڕژێم کاریـان دەکـرد لە نـاوچەی قەرەچـوغی نزیـک تکریـت دەسـگیرکران لەنـاو جەمـاوەر بڵاویـان کـردەوە کەوا چەنـد کرێکارێــک گیــراوە، وە لە ڕادیۆکەشــیان لەبەر خــاتری سۆشــیال دیموکراتەکـان بڵاویـان کـردەوە کەوا هەنـدێک (کـوردی نەزان عولەمـای فرنساوی دەفرێنن و داریان پـێ دەشکێنن)... بەوەشـەوە ڕانەوەستاون، بۆ خۆیان هەرچی ڕەفتارێکی ناشۆڕشگێڕانەیان کردبێ گورج داویانەتە پاڵ پێشمەرگەکانی حزبمان، وەکو جەماوەری کوردستان نەزانـن کـێ سـەرانەو تراکتۆرانەو فەرمانبەرانەو سەربازانەو تەلەفزیۆنانەیان لێ وەردەگرێ. وەکو لایەنەکـانی کوردسـتان ئاگـادار نەبـن کەوا چەنـد جـار لەلایەن ئـێمەوە هاوڵاتیان، نێردراون بۆ وەرگرتنەوەی پارەی خەڵکی ڕووت کراوە لە دەورو پشـتی بارەگاکانیـان. وەکـو بە دەیـان نامەیـان لای هاوڵاتیـان نەبێـت کە کردویـانەتە سـەریان بـۆ پـارە. دیـارە ئەوەیـان لەبیـر چـۆتەوە کە مەکتەبـی عەسکەریان ڕوون کردنەوەیەکی دەرکردوە بـۆ هاوڵاتیـان کەوا خەڵکـی بە

ناوی پێشمەرگەی ئەوانەوە ڕاو و ڕووت دەکەن بیان ناسن....

ناو و ناتۆرەکانیان هێندە نزم بووە گەیشتە ئەو ڕادەیەی کەوا چەند جارێک لە وتاری سیاسی و لە ئیستگەکەیاندا بڵاوی بکەنەوە کەوا حزبی سۆسیالیست یەک نوقورچکی لە دوژمن نەداوە!! ئەو هەموو درۆو بوختانە شاخدارانە.. ئەو هەموو ناو و ناتۆرە بێ مانا و بێ بنچینانە.. کە جەماوەری کوردستان دەیان جار گوێیان لێ بووەو لە ڕەفتاری ڕۆژانەی لێپرسراوانی یەکێتی نیشتیمانی دیویانەو پاشان بۆیان ساغ بۆتەوە کە هیچی لە جێگای خۆی نەبوەو بە پێچەوانەی ڕاستەقینەوە بون. جەماوەری کوردستان ئێستا پرسیارێکی سادەو ساکار ئاڕاستەی یەکێتی نیشتیمانی دەکات. ئەگەر ڕاست دەکەن ئێوە بڕواتان بە ژیانی دیموکراتی هەیەو جەماوەری کوردستان پشتگیری سیاسەتەکەتان دەکات و حزبی سۆسیالیستی کوردستان هیچ دەورو جەماوەری نیە ئیتر بۆچی هێندە خۆتانی پێوە خەریک دەکەن، خۆ دەنگدانێکی ئازادو دیموکراتیانەی سەر گۆڕەپانی خەبات بەسە بۆ ئەوەی ببنە تاکە سواری مەیدان و سەرکردایەتی خەباتی گەلی کورد بکەن، ئیتر چی پێویست دەکات بە شەڕو کوشتارو قەلاچۆ کردنی خەڵک؟!

هاووڵاتیانی بەڕێز.. ئێمە کە ئەم جارە ناچارین لە بەیاننامەکەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەدەنگ بێین و وەڵام بدەینەوەو ڕاستیەکان باس بکەین و پێکەوە مناقەشەیەکی هێمنانەی خاڵەکانی ئەو بەیاننامەیە بکەین، لەبەر ئەوە نیە کە گومانمان هەبێت کە لە ڕاستیەوە نزیک بن یان گومانمان هەبێت کەس بڕوایان پێ دەکات بەڵکو بۆ ئەوەیە جەماوەری گەلەکەمان لە شێوەیەکی تازە بابەتی پەلپ و بیانوی شەڕ فرۆشتنی یەکێتی نیشتیمانی ئاگادار بکەین و هۆیە ڕاستەقینەکانی ئەم پیلانەشیان بۆ ئاشکرا بکەین تاکو هەموو لایەک پێکەوە بە بەرچاو ڕوونی تەواوەوە هەوڵی لەبار چواندن و پوچکردنەوەی بدەین وە بەم خاڵانەی خوارەوە هەندێ شت ڕوون دەکەینەوە کە تیایدا وەزعی ناسکی ئێستای خەباتەکەمان دەردەخەین و هەندێ پیلانەکانی ڕژێمیش دەخەینە

بەر چاوی جەماوەری گەلەکەمان:

١- پیلان و مانۆرەکانی ڕژێمی فاشی بەعسی عەفلەقی بەغدا بۆ بەگژا یەکدانی هێزە نیشتیمانیەکانی کوردستان و بە کوردی کردنی شەڕ، ماوەیەکە بە ئاشکرا درێژەی هەیە لەژێر ناوی سەوداو سەوداکاری و پێکهاتن لەگەڵ هەندێ (لایەنی کوردی) بە قسەی ڕۆژنامەی عیراق کە لە ڕۆژی ١٩٨٢/١٢/١٨دا بڵاوی کردۆتەوە گوایە (هەندێ لایەن ئارەزوویان پیشان داوە کە لەگەڵ ڕژێم هاوکاری بکەن). وە دەستگای ئەمن و ئیستخبارات و خۆفرۆشەکانی ڕژێمیش دنیایان پڕ کردبوو لەو جۆرە دەنگ و باسانە و جەماوەری کوردستانیش گوێیان لێ بوەو زۆریش لەو بابەتە قسانەی بیستوە کە هەراسانی و ناڕەزایی و هەندێک جاریش وشیاریان داوەتە حزبمان و لایەنەکانی جود.

٢- بارو دۆخی ئێستای خەباتی گەلەکەمان لە وەزعێکی زۆر ناسک و مێژوویی دایەو هێزە شۆڕشگێڕە دڵسۆزەکان لە هەموو کاتێک زیاتر مەسئولیەت ڕوویان تێ دەکات و پێویستە لە هەموو کاتێک زیاتر دان بەخۆیاندا بگرن و پشوو درێژ بن بە کردەوەش خۆنەویستی و فیداکاری زیاتر نیشان بدەن بۆ پوچ کردنەوەو تێکشکاندنی نەخشەو پیلانە گڵاوەکانی ڕژێم

٣- جەماوەری کوردستان کە هەمیشە بە سەلیقەی شۆڕشگێری زیانەکانی شەڕی برا کوژی لەبەر چاو بوەو زۆر پێوەی هەراسان بوە، لەم کاتەدا چاوەڕوانی یەکبون و تەرکیز کردنە سەر ڕژێمی فاشی دەکات وە هەر لایەنێک گەوجانە یاری بەو ئاگرە بکاتەوە، تەئسیرێکی زۆر سلبی دەبێت لەسەر ورەی جەماوەرو سارد کردنەوەو لەبار چواندنی جۆش و خرۆشی شۆڕشگێڕانەیان.

٤- حزبی سۆسیالیستی کوردستان هەمیشە شانازی بەوە کردوە کە لە پێشەوەی هەڵگرانی ئاڵای تەبایی و برایەتی و هاوخەباتی بوەو لەو پێناوەدا وا هەست دەکات زۆر لەخۆبوردنی کردوە و کاتێک کە بەرژەوەندی بەرزی خەباتی یەکگرتوی میللەت پێویستی کردبێت دانی

بەخۆیدا گرتوەو تەنانەت لەسەر خوێن و لاشەی شەهیدە بە ناهەق کوژراوەکانیشیدا دەستی لێبوردن و برایەتی درێژ کردوە، وە لەناو چوارچێوەی بەرەی نیشتیمانی دیموکراتی، هاوکاری هاوپەیمانەکانی زۆر جار فریای ئەوە کەوتوە کە نەهێڵێ شەڕی برا کوژی لەنێوان یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستاندا ڕوو بدات، وا بزانین برایانی یەکێتی خۆیان زۆر نمونەیان لەم بارەوە لەبەر چاوە.

وە هەر لەم ڕۆژانەدا کە لە ناوچەی سەرگەڵو، یەکێتی نیشتیمانی هێزەکانی خۆی کۆکردبۆوە بۆ شەڕی (پارتی) هەڤاڵانی ئێمەو برایانی حزبی شیوعی جهودیان سەرف کرد بۆ ئەوەی شەڕو لێکدان نەبێت و وەزعەکە هێمن بکەنەوە.خۆ ئەگەر ئێمە نیازی شەڕ فرۆشتن و تۆڵە سەندنەوەی عەشایەریانەمان هەبوایە، زۆر دەرفەتمان بۆ ڕەخساوە کە لە ڕێگای بەکار هێنانی چەک گیروگرفتەکانمان لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لابەلا بکەین. بەڵام هەر ئێمە بوین کە ئەو کەلکەلەو خەیاڵەمان گۆڕ کرد، گوایە دەتوانرێ لە ڕێگای کوشتن و بڕین گیرو گرفتەکان چارەسەر بکرێن. وە بە خەباتی ناوکۆیی ئێمەو هاوپەیمانەکانمان بوو کە سەر ئەنجام مەنتیقی کوتەک و زۆرە ملێمان تێک شکاندو سەلماندمان کە تاکە ڕێگای چارەسەر کردنی گیروگرفتەکان تەنها وتوویژی برایانەیە کە پار پاش چەند کۆشش و هەوڵ و تەقەلای دڵسۆزانە شەڕی برا کوژی لەنێوان یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و هەموو لایەنەکانی تری سەر گۆڕەپانی خەبات وەستاو خەڵکی کوردستانیش زۆر شادمان بون و بە سەرەتای سەرکەوتنیان دانا.

٥- لە کۆبونەوەی ئەم دوایییەی لیژنەی باڵای بەرەی نیشتیمانی (جود) جارێکی دیکەش تەئکید کرایەوە لەسەر سیاسەتی تەبایی و کەم کردنەوەی ئاڵۆزی نێوان هێزەکانی جود و یەکێتی نیشتیمانی وە لەم ماوەیەدا زۆر جهودی هاوبەش و دڵسۆزانە سەرف کراوە وە ئەوەی لە تواناداا بووە کراوە بۆ ئەوەی ڕێگا لەباری ئاڵۆز ببڕدرێتەوە وە نەک هەر

ئـێمه گلەیـی و گازەنـدەمان هەبـووە لەدەسـت چەکـدارەکانی یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان بەڵکـو هەمـوو لایەنەکـانی جـود لە ئـێمە زیـاتر هەراسان بوون لە هەڵوێستە چەوتەکانی یەکێتی نیشتیمانی. بەڵام هەموو لایەک ڕێگـای دان بەخـۆدا گـرتن و پشـوو درێـژی و بـێ دەنگیمـان هەڵبژاردوە، وە هەڵوێستی نەرمی حزبمان جێگای ڕەخنەی چەندین لایەنی هاوپەیمان و جێگای تەقدیری هەندێ لایەنی تر بووە.

٦- لەبەر ئەو ڕۆشـنایی ئەو ڕاسـتیانەی سـەرەوە هەمـوو لایەک گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی کە یەکێتی نیشتیمانی ئەگەر دڵسۆز بێت بۆ ئەو دروشمانەی بەرزی کردۆتەوە، هیچ بیانویەکی بەدەستەوە نەماوە کە پەلاماری حزبمان بدات. چونکە ئەوەی کە جێگای سەرنجە زۆر لە برایان لێپرسراوی بەرزی یەکێتی نیشتیمانی لە کۆبونەوەو نەدوەکانیاندا باسی ئەوەیان کردوە کەوا لەگەڵ ڕژێم ڕێک دەکەون بەڵام چەکدارەکانیان هەر لە شاخ دەمێننەوە.

برایانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئەم جارە لە ئاژاوە نانەوەو بڕو بیانو دروست کردن بۆ بەرپا کردنی شەڕ شێوەیەکی تازەیان گرتۆتە بەرو خۆیـان بە سـتەم لێکـراو پیشـان داوەو ئەم جـارە بەنـاوی پەکخسـتن پلانـی شـەڕی بـرا کـوژی و کوردانـدنی شـەڕەوە، دەیـانەوێ کوردسـتان بـکەنەوە مەیـدانی شـەڕو لێکـدان. بیانویـان گـۆڕاوە، بەڵام مەبەسـت هەروەکـو خۆیەتی. وەکو ئەوەیان لەبیر چوبێت کە لە ماوەی شەش ساڵی ڕابردوو بیـرو ڕاو لێکـدانەوەو هەڵسـەنگاندن و بۆچـوونە سیاسـیەکانیان کە لە چاپەمەنیەکانیانـدا تۆمـار کـراوە. وە ڕەفتـارو کـردارو هەڵوێسـتەکانیان هەمووی بۆ حەڵاڵ کردنی شەڕی برا کوژی بووەو بە شانازیەوە لەگەڵ هەمـوو لایەکیـان کـردوە وە هـیچ کاتێـک گوێیـان بە ڕای گشـتی جەمـاوەری کوردسـتان و هێزە سیاسیەکانی تـر نەداوە، چەنـدین جار هەر لەبەر ئەوە پەلامـاری هەڤاڵانی ئێمەیـان داوە چـونکە وشـەی شـەڕی بـرا کوژیمان بەکار هێناوە. ئێستاش چەندین بەڵگەی دەستنوسی لێپرسراوانی یەکێتیمـان لایە کە پڕیەتـی لە هەراسـانی و قەڵـس لە حزبمـان چـونکە

بڕوای بە شەڕی برا کوژی نەبووەو لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا ڕیسواو بەدناوی کردووەو بە کارێکی زان بەخشی داوەتە قەڵەم. بێگومان ئەمە ڕای جەماوەریش بووە.

برایانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان وای تێگەیشتون کەوا بە گۆڕینی قسەو تاکتیکی ڕۆژانەیان هەموو ڕەفتارو کردەوەکانی ڕابردویان دەسڕدرێتەوەو هەموو ڕاستەقینە مێژوویی و مەوزوعیەکان دەگۆڕن، وەکو خەڵکی کوردستان هیچیان نەدیبێت و گوێیان لە هیچ نەبوبێت و لە ناو ڕووداوەکاندا نەژیابن. هەڵەو کەموکوڕی سیاسی بە ڕاکردن و خۆ گێل کردن لە ڕابردوو چارەسەر ناکرێن کەوا بەسەر لایەنی ترا بسەپێنرێن بەڵکو هەڵوێستی شۆڕشگێڕی هەر حزبێک ئەوەیە بە جورئەتەوە وە بە چاوی ڕەخنەگرانەوە بە خۆیدا بچێتەوەو هەڵەو کەموکوڕیەکانی دەست نیشان بکات و بێ باکانە باسیان بکات و دووبارەیان نەکاتەوە.

بۆ برایانی یەکێتی نیشتیمانی وا باشتر بوو کەوا سەرەتای شەڕی برا کوژی کەوا لە ڕابردودا پەیڕەویان کردوە بۆ نەهێشتنی ناحەزە سیاسیەکانیان بە توندی ڕیسوای بکەن و تاوانباری بکەن....

بەڵام برایانی سەرکردایەتی یەکێتی لە جیاتی ئەوەی بە خۆیاندا بچنەوەو بە جدی بۆ هۆیەکانی شەڕی برا کوژی بگەڕێن لە خۆیاندا نەیان هێڵن، کەچی بە سوک و ئاسانی و زۆر بە سادەیی دەستی چەوری خۆیان بە ئێمە هەڵسووەو خۆیان کردوە بە دڵسۆزی برایەتی و تەبایی و تاوانی شەڕ فرۆشتنیان داوەتە پاڵ سەرکردایەتی حزبمان و بۆ ئەو مەبەستەش چەند ڕوداوێکی دروست کراوی بێ ئەساس و چەند ڕوداوێکی شێوێنراویان بە ئاوەژوو و بە بەڵگە هێناوەتەوە کە لە دواییدا باسیان دەکەین و بە بەڵگەی زیندو و ڕاستەقینەکان دەخەینە ڕوو.

برایانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە بەیاننامەکەیاندا دەڵێن ئەرکەکانی سەر شانی خۆمان پاش وەستاندنی شەڕیساڵی پار بەوپەڕی پەرۆش و دڵسۆزیەوە بەجێ هێناوە. دیارە لێرەدا

قسەکانیان ئاراستەی هەموو لایەنەکانی جود دەکەن و دەیانەوێ وای دەرخەن کەوا لایەنەکانی جود ئەرکەکانی سەر شانی خۆیان ئەنجام نەداوە بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە ئێمەو برایانی یەکێتی نیشتیمانی هەبوو لە ڕێکەوتی ١٩٨١/١١/٢٥دا ئێمە هیچ کەمو کوڕی و لادان و خۆدزینەوەیەک لە خۆمان شک نابەین بە پێچەوانەوە یەکێک لە خاڵەکانی ئەو ڕێکەوتننامەیە دابین کردنی مافی ئازادی چالاکی سیاسی و عەسکەری بوو لە کوردستاندا بۆ هەموو هێزەکان بەڵام برایانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان تاوەکو ئێستا لە ناوچەی قەرەداغ هەڵوێستی دوژمنانەیان هەیەو ناوچەکەیان قەدەغە کردووەو هەر کاتێک هێزەکانی ئێمە چوبنە ئەو ناوچەیە بەرەنگاریان بون و شەڕیان لەگەڵدا کردون بە پێچەوانەی ناوچەکانی دەشتی هەولێر کە ئێمە ئازادی چالاکی نواندنی هەموو لایەکمان دەستەبەر کردووەو هیچ لایەک ڕێگای لێ نەگیراوە.

بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە برایانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دان بە راستەقینەیەکدا دەنێن کاتێک دەڵێن لەم قۆناغە مێژووییەی ژیانی گەلەکەمان کە هەلو مەرجێکی لەبار لە مەیدانی پێشمەرگەیی و سیاسی و جەماوەری و ئیعلامی لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق و ناوچەکەو جیهان بۆ خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد لە عێراقدا هەڵکەوتووە کە بە هەنگاوی توند بەرەو سەرکەوتن بچن بەڵام هەندێ دزو دەست ڕەش و گومان لێکراو لە سەرکردەکانی حزبی سۆسیالیست هەوڵ دەدەن بۆ لەبار چواندنی ئەو دەرفەتەو هەڵگیرسانەوەی شەڕی برا کوژی لە ڕێگای خولقاندنی ڕوداوی دروست کراو و پەڵپ و بیانوی ناڕاستەوە....

بەراستی دەمانەوێ لەگەڵ برایانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هەندێک بە ڕوونی و ئاشکرایی و وە بە برایانە مناقشەی ئەو خاڵە بکەین وە لە ڕەخسانی ئەو دەرفەتە لەبارە بۆ خەباتی گەلەکەمان لە ئەنجامی گۆڕانەکانی ناوخۆ و ڕوداوە بابەتیەکانی هاتۆتە کایەوە...

بەڵام ئایا ئەوە ئێمەین یان ئێوەن؟ کە ڕێگا نادەن سود لەو هەلومەرجە لەبارە وەربگیرێت لەڕووی پێشمەرگەیی و سیاسی و جەماوەری و ئیعلامی ...

جەماوەری میللەتەکەمان و هێزە نیشتیمانیەکان شاهیدی ڕووداوەکانن ئایا ئەوە حزبی سۆسیالیست بوو یان یەکێتی نیشتیمانی کەوا پێشمەرگەکانی لە سەنگەرەکانی خوارەوەی دژایەتی ڕژێم دەکشایە دواوەو دووچاری شەڕی لابەلایی دەکردن. بێگومان بۆ ئەم ڕاستیە بڕوامان وایە کە پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتیمانی خۆیشیان ناتوانن ئینکاری ئەوە بکەن.

حزبی سۆسیالیستی کوردستان لەم ماوەیەدا بە هەڵوێستی نەگۆڕاوی شۆڕشگێڕانەی خۆی بەردەوام بووە لە ئاڕاستە کردنی زەبری کاریگەر لە دوژمنی فاشی و دامودەزگاکانی.

ئایا حزبی سۆسیالیستی کوردستان یان یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بووە کەوا پاشەکشێی کردوە لە هەڵوێستی سیاسی خۆی لە ڕژێم و لە دروشمی ناوەندی خەبات.

ئێمە لەکاتێکدا بەرچاو ڕوونانە سوور بوین لەسەر ئەوەی کە دوژمنی سەرەکی گەلەکەمان لەم قۆناغەدا ڕژێمی فاشی بەغدایە. بەڵام ئایا ئێوە نەبوون کەوتنە گفتوگۆ کردن و پاساو هێنانەوە بۆ سازش و گوێزانەوەی مەیدانی خەبات لە شاخەوە بۆ شار؟

ئەی هەر ئێوە نین، برایانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کە هەر مانگەی جارێک هێزەکانتان کۆدەکەنەوە بۆ بەگژا کردنی ئەم لا یان ئەولا، یان دوژمنە ستراتیجیە تازەکانتان. ئێمە بووین ئسوڵی ڕەفتاری دۆستایەتی و هاوپەیمانیمان لەگەڵ دۆستەکانمان پێشێل کردو لەپڕ پەلاماری لەشکری ئیسلامی هاوخەبات و هاوسەنگەرەکانی خۆمانداو قەتل و عاممان کردن. ئایا ئێمە لە دەستگاکانی ڕاگەیاندنی خۆمان و بڵاوکراوەکاندا پەلاماری هێزە نیشتیمانییەکانی ترمان داوە.

ئایا ئێمە یان ئێوە هەندێک ناوچەیان بە قەدەغەکراو و داخراو لەبەردەم

هێزەکانی تر هێشتۆتەوە. ئێمە بووین یان لێپرسراوەکانی ئێوە بوون کە گیانی بەزاندن و ڕووخاندنیان لەناو جەماوەرو پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان بڵاودەکردەوە، کاتێک بۆ حەڵاڵ کردنی سازش بڵاوتان دەکردەوە (پێشمەرگە ماندووە)، (سەدام ناڕوخێ)، (کورد هەقی چیە بەسەر عێراقەوە)، (حوکمی ئیسلامی کە دێتە کایەوە لە سەدام خراپترە).
لەو کاتەدا کە ئێوە بەو هەڵوێستانەتان وورەو حەماسەتی جەماوەرتان سارد دەکردەوە حزبی سۆسیالیستی کوردستان بە هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەو مەعنەویاتی بەرز و بەرچاو ڕوونی تەواو تەموومژی لەبەرچاوی گەلەکەمان دەتەراندو دەرسی فیداکاری و گیانبازی دەدایە دوژمن و، مانۆرو پیلانەکانی لێ ڕیسوا دەکرد. ئایا ئێمە یان برایانی یەکێتی نیشتیمانی بەچاوی بێ بایەخی تەماشای خەباتی هێزە نیشتیمانیەکانی ترمان کردووە وە بەردەوام پێشمەرگەو کادرەکانمان بە گیانی دژایەتی و ناحەزی هێزەکانی تر پەروەردە کردووەو هانمان داون کە شەڕی لایەنەکانی تر بکەن.
ئایا ئێمە ئیدعای دەسەڵاتداری کوردستان و مافی حاکمیەتمان کردووە یان برایانی یەکیەتی نیشتیمانی.
ئەگەر برایانی یەکیەتی نیشتیمانی بەڕاستی وەکو ووتویانە بە پەرۆش بوونایە بۆ سوود وەرگرتن لەو هەل و مەرجە لەبارە هەرگیز وا نامەوزوعیانە ڕاستیەکانیان نەدەشێواندو ئۆباڵی ئەو وەزعەیان لە ئەستۆی خۆیاندا لانەدەداو فرێیان نەدەدایە سەر حزبمان. ئەگەر ئەمەیان بۆ وازهێنان و پاشەکشێ لەو هەڵوێستانەی سەرەوەیان بێت، خۆ ئەمە بەردەوام بوونە لەسەر هەڵوێستی سیاسی چەوت بەڵام بە شێوەیەکی تر. برایانی یەکیەتی نیشتیمانی ئەوەیان کردووە بە عادەت هەر کاتێک لەباری سیاسیەوە شکست دەخۆن و هەڵوێست و بۆچوون و تاکتیکە سیاسیەکانیان کە لە ڕوانگەی تاکڕەویەوە نەخشەی بۆ دەکێشرێ و بە ڕواڵەت هەڵگەڕانەوەیە لە هەڵوێستە سیاسیە ستراتیژیەکانیان ئەنجامی دەدات کە زیاتر بەتاق دەکەون و سەرلێشێواوی و نارەزایی دەکەوێتە ناو

ڕیزەکانیانەوە، بۆ داپۆشینی ئەو بارەیان ناکۆکیەک لەگەڵ لایەنێک دروست دەکەن، وە لەجیاتی ئەوەی ڕاستی بە هێزەکانیان بڵێن یەکسەر بە دوژمنێکی دروست کراو دەیان ترسێنن.

هەروەکو مەسەلە کوردیەکەی دەڵێ (تاکو ماخۆماڵ دزی گرت دز ماخۆماڵی گرت) دیارە ئەمە لە ئێمەو برایانی یەکیەتی قەوماوە. لەبەر ئەوە بە پێویستی دەزانین بە ڕووناکی خستنە سەر ڕاستیە بابەتیەکان پەیوەندی نێوان هەردوو لامان پیشان بدەین لە ماوەی پاش وەستاندنی شەڕەکەی پاری یەکیەتی لەگەڵ لایەنەکانی سەر گۆڕەپانی خەبات بۆ ئەوەی باشتر درۆو ڕاستی بەیانەکەیان دەرکەوێ.

پار تاکو ئێستا بخەینەڕوو. بۆ ئەوەی ڕاستی ناوەرۆکی بەیانەکەیان شی بکەینەوە

(١) لەچەند نووسراو و یاداشتی کە دواییەکەیان یاداشتی ڕۆژی ١٩٨٢/١/٢٢بوو داوامان لە برایانی یەکیەتی نیشتیمانی کردو (پێش وەستاندنی شەڕو دوای وەستاندنی شەڕ) بۆ دانانی دادگایەکی هاوبەش بۆ محاکمە کردنی ئەو بکوژانەی کە هەڤاڵانی ئێمەیان شەهید کردبوو وە لەلای یەکیەتی حەوێندرابوونەوەو ژمارەیان (٦) تاوانبار بوو وە دوو جارانیش برایانی حزبی شیوعی عێراق بۆ ئەو مەبەستە ڕاسپێردران کە لەگەڵ یەکیەتی نیشتیمانیدا قسە بکەن کەچی ئێستاش ئەو بکوژانە ژمارەیەکیان ماون و دەوری مەسئولیەتیشیان هەیە.

(٢) لە خاڵەکانی ڕیکەوتنی ١١/٢٥دا تاکید لەسەر ئەوە کرایەوە کە ئیتر هیچ لایەک دەست نەخاتە ئیشوکاری ناوخۆی لایەکانی ترەوە بەڵام برایانی سەرکردایەتی یەکیەتی نیشتیمانی بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو خاڵە لەسەر سیاسەتی پێشویان بۆ دەست خستنە ناو ڕیزەکانی حزبمان بەردەوام بوون. ئەوەبوو چەند پێشمەرگەیەکمان هەندێ گیروگرفت و مشاکلیان هەبوو کە زیاتر پەیوەندی بە نەداری حزبەوە هەبوو. سەرکردایەتی یەکیەتی کەوتنە دڵخۆشی دانەوەیان و چارەسەر کردنی گیروگرفتە مالیەکانیان و لەپاشان بەیانێکیان بەناویان لە ئیستگەکەیان

بڵاوکـردەوەو کەوتـنە پڕوپاگەنـدە کـردن پێیـان لە دژی حزبمـان. دیـارە فریـودان و ڕاکێشـانی پێشـمەرگە لەسـەر ئەساسـی پـارەوپوول کـارێکی ناشۆڕشگێڕیەو پێشمەرگە فێری هەلپەرستی و پارەپەرستی دەکات کە دوژمن لە ئەنجامدا سوودی لێ وەردەگرن.

(٣)لە کۆتـایی مـانگی ٩٨٢/٣ هەڤـاڵێکی کادرمـان بە نـاوی هیـوا (مهدی) لە گوندی وەرتـی لەلایەن چەکدارەکانی یەکیەتـی نیشـتیمانی بەشەو شـەهید کـرا، چـونکە ڕۆژی پێشـوو موناقەشـەی سیاسـی لەگەڵ چەنـد کەسـێکیان کردبـوو. (٤) ئـازاد خۆشـناو کە یەکێـک بـوو لە کادرەکانی یەکیەتـی نیشـتیمانی کوردسـتان و لە ئەنجامی زنجیرەیەک گیروگرفت و مشاکلی سیاسی لەو ماوەیەدا دوو خزمی اعـدام دەکرێن و ڕۆژێک لە ئەنجامی مناقشـەی سیاسـی لە نێوانـدا دەبێتە تەقەو لێکدان کادرێکیـان دەکـوژرێ. پاشـان ئـازاد خۆشـناو دەیەوێت بـڕوات تەسـلیمی ڕژێم بێتەوە بەڵام کاتێـک تووشی هێزەکـانی ئـێمە دەبێت و داوایـان لـێ دەکات کەوا بیپارێزن و ئامادەشە بۆ محکمە. ئێمەش پێش ئەوەی ئـازاد خۆشــناو لای خۆمــان وەربگــرین بە نووســراوی ژمــارە ١٢٠١ ڕۆژی ١٩٨٢/١/٢٢ یەکیەتــی نیشــتیمانی کوردســتانمان ئاگــادار کــرد کەوا ئامادەین بۆ ئەوەی ئازاد خۆشناو لەلایەن دادگایەکی هاوبەش محاکمە بکرێ. بەڵام برایانی یەکیەتی خۆیان بوارد.

(٥) دوو پێشـمەرگەمان کە بە ئیجـازە چووبـوونە سـەردانی کەس و کاریـــان لەلایەن چەکـــدارەکانی یەکیەتـــی نیشـــتیمانییەوە لە ڕۆژی ١٩٨٢/٢/١٧ لە گونـدی شاخەپیسـکە چەک دەکرێن و لەپاشـان زۆر بە نامەردی یەکێکیان بەناوی (جوهر محمـد) شـەهید دەکەن و ئەوی تـریش بە ناوی (جاسم) بە لوولە تفەنگ چاوی دەردەهێنن.

(٦) لە کۆتایی مانگی ١٩٨٢/٥دا (٣) پێشمەرگە لە گوندی قەشقە لەلایەن مەفرەزەیەکی سەر بە یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان کەمینیان لێ دانرایەوەو شەهید کران و بە نووسراوی ١٢٩٥ لە ١٩٨٢/٦/١٢ داوامان لە سەرکردایەتی یەکیەتـی نیشـتیمانی کـردو چەنـد شـاهید و بەڵگەمـان

خستە بەردەست کە لێپرسراوی مەفرەزەکەیان سەر بە میری بووەو نۆکەری عیسا دەم خواری جاش بوو. هەرچەندە بە نووسراوی ٢٧٥/س ڕۆژی ١٩٨٢/٧/٧ بەڵێنیان داینێ کەوا تاوانبارەکان لە ڕێگای دادگاوە بە سزا دەگەیەنن بەڵام بەداخەوە هەر قسە بوو.

(٧) لە هاوینی ڕابووردوودا کاتێک مەفرەزەیەکی هەرێمی ٥ی شارەزوورمان دەیەوێت بچێتە قەرەداغ بۆ سەردانی خزم و کەسوکاریان لە ڕۆژی ١٩٨٢/٧/١٠ لەگوندی (نەمەل) لەلایەن هێزەکانی یەکیەتی دەوریان دەگیرێ و تەقەیان لێ دەکرێ لە ئەنجامدا پێشمەرگەیەکمان بە ناوی (سلێمان تلەزەیتی) شەهید دەکەن و یەکێکی تریش بریندارو یەکێکیش بەدیل دەگرن.

(٨) لە ڕۆژی ١٩٨٢/٨/١١ پێشمەرگەیەکی حزبمان بە ناوی (حمە کانە گەرمیانی) لە لایەن چەکدارەکانی یەکیەتی نیشتیمانی چەک دەکرێت.

(٩) لە ڕۆژانی ٢٤-١٩٨٢/٧/٢٥ لە دەشتی کۆیە لەلایەن دوو لێپرسراوی یەکیەتی نیشتیمانی بەناوی شێخ شەماڵ و سەرباز کەمین بۆ هەڤاڵانی هەرێمی ١٥ مان دادەنێنەوە بەڵام هاونیشتیمانی ناوچەکە خەبەر دەدەن بە پێشمەرگەکانی حزبمان و ناهێلن بکەونە کەمینەکەوە.

(١٠) نزیکەی دوو مانگ پێش ئێستا پێشمەرگەیەکی هەرێمی ١٥ مان بەناوی ئازاد زاهیر لەگەڵ ژمارەیەک چەکداری یەکیەتی لە گوندێکی دەشتی کۆیە دەکەوێتە مناقەشەی سیاسی چەکدارەکانی یەکیەتی کاتێک ناتوانن لە مناقەشەکەدا خۆڕابگرن پەلاماری دەدەن و چەکی دەکەن.

(١١) لە ڕۆژی ١٩٨٣/١/٢٢ کاتێک مەفرەزەیەکی قارەمانی هەرێمی ١٥ مان بە لێپرسراویەتی هەڤاڵ کاکەسوور چەند دەست وەشاندنێکی قارەمانانە ئەنجام دەدات دژی ڕژێم و لە گەڕانەوەدا لەلایەن چەکدارەکانی یەکیەتی کە لێپرسراوەکانیان (شێخ شەماڵ و سەرباز) بوون بەناوی دۆستایەتی و ناسیاوی دەوریان دەگیرێ و چەک دەکرێن و

لێپرساوەکەشیان کە هەڤاڵ کاکەسوورە بە بەندی ڕەوانەی ناوزەنگ دەکرێ و ئێستاش بەندە لایان و هەڕەشەی کوشتنیشی لێ کراوە.
سەرکردایەتی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان لە بەیاننامەکەیاندا چەند ڕووداوێکی هەڵبەستراو و دروست کراویان باس کردبوو کە گوایە پێشمەرگە قارەمانەکانی ئێمە کردویانە. هەروەها چەند ڕووداوێکیشیان بە ئارەزوو شێوێنراو تێکەڵاو کردبوون کە بەقەد ئەرزو ئاسمان لە واقیعەوە دوورن. بۆیە بە پێویستمان زانی کەوا مناقەشەیان بکەین.
(١) باسی مەوزوعی تەقە کردن لە دۆڵە ڕەقە لە (عمر حاجی ئیبراهیم) دەکەن کە گوایە پێشمەرگەی ئێمە بە ئارِ بی جی چوونەتە سەری وە تەقەیان لێ کردووە. سەبارەت بەو ڕووداوە کە خەڵکی دۆڵە ڕەقە و پێشمەرگەو هەموو جەماوەری کوردستان باش دەزانن کەوا عومەر حاجی ئیبراهیم تاوانبارێکەو بەشدار بووە لە شەهید کردنی (٨) پێشمەرگەی دیلی حزبمان ئەگەر ئێمە بڕوامان بە ئینتیقامی عەشایەریانە هەبێت باکمان نییەو مافی خۆمانەو بە ئاشکراو ئیعلانیشی دەکەین. بەڵام ڕاستیەکەی کە هەوڵ دراوە بشاردرێتەوە ئەوەیە ناوبراو لەلایەن یەکێک لە مەسئولەکانی خۆیان کە ناوی (شێخ هۆمەر) بوو تەقەی لێکراوەو هیچ پەیوەندیەکی بە حزبمانەوە نیە. ئەم ڕاستیە لە خۆشیان و لە هەموو کەسیش ڕوونە.
(٢) باسی ئەوە دەکەن کە گوایە لە کۆمتان کەمینیان بۆ دانراوە. ئەو ڕووداوە هاوڕێیانی حزبی شیوعی ئاگادار بوون کاتێک کە مەفرەزەیەکی حزبمان میوانی ڕەشماڵێکی ڕەوەندەکان بوون و بۆ چارەسەر کردنی کێشەو لەوەڕو پاوانی ڕەوەندەکان دەچنە ئەوێ. لەوکاتە سەیارەیەکی پڕ لە پێشمەرگە لە کۆمتانەوە دێت و نزیک ڕەشماڵەکە دەوەستێ و چەند پێشمەرگەیەکی لێ دادەبەزێ وە یەکسەر ڕادەکەن بەرەو شاخەکەو دەست دەکەن بە تەقە کردن. پاش ماوەیەک بیستمان کەوا (عەلی نەبی) ناوێکی تێدا بووەو ناوبراو لەخۆی بە گومان بووەو وا تێگەیشتووە کە پێشمەرگەکان بە تایبەتی بۆ ئەو چوونەتە سەر جادەو

نیازی خراپیان لەگەڵیا هەیە.

(٣) باسی بەچکە ئاغایەک دەکەن کە گوایە لە جاشەتی گەڕاوەتەوەو پاشان پ.م مەلا حەسەنی شەهید کردووە. بەڕاستی پێمان خۆش نەبوو باسی بەچکە ئاغا بکەن چونکە کورد گوتەنی یەکێک ماڵی سەرتاپا لە شووشە بێت هەق نیە بەرد بگرێتە پەنجەرەی خەڵکی تر. ئەم مەوزوعە خەڵکی کوردستان و هێزە نیشتیمانیەکان باش دەیزانن ئاخۆ دەرەبەگ و بەچکە ئاغاو کەسانی گەڕاوە لە جاشیەتی و خیانەت ڕوو لە چ لایەک دەکەن و ئێستا مەوقیعیان لە کوێیە. بەڵام دەربارەی ئەو بەچکە ئاغایەی باسیان کردووە دوو ساڵ و نیو پێشمەرگە بووە لای خۆیان و هەر لای خۆشیانەوە هاتۆتە پاڵ ڕیزەکانی حزبمانەوە. ڕاستی ڕووداوەکە لە قوللەی کانی ماران بووەو خەڵکی گوندەکەش هەموویان ماون و نزیکیشن لە هەموو لایەکەوەو بە ئاسانی دەتوانرێ لێکۆڵینەوە بکرێ و ڕاستیەکەش بۆ هەموو لایەک مەعلومە تەنانەت هەتا بۆ برایانی سەرکردایەتی یەکێتیش بەڵام قەرەنی لەگەڵ مەفرەزەیەکی ١٠ کەسی کاتێک دەچێتە گوندی قولەی کانی ماران مەلا حەسەنی مەلا ڕەش لەگەڵ ٣٠ پێشمەرگە لە مزگەوتی گوندەکە دەبن. ئەمانیش بۆ خۆیان لە ماڵێک دادەمەزرێن بۆ نان خواردن لە دوایدا لەلایەن مەلای ڕەش داوایان لێ دەکرێ بۆ کۆبوونەوە بۆ باس کردنی مەوزوعی چەکی چەند پێشمەرگەیەک کە چەند ڕۆژی پێش لەلای مەلاوە چوونەتە لای قەرەنی. بەڵام بۆ ئەم مەبەستە قەرەنی وەڵام دەداتەوە کە مەوزوعی چەک لە سەرکردایەتی نەبێت چارەسەر ناکرێت چونکە مەوزوعێکی ئاڵۆزو تێکەڵاوە. پاشان لەسەر ئیلحاحی لێپرسراوی برایانی یەکیەتی لە شوێنێکی محاید دادەنیشن و خەڵکی گوندەکەش بەشدار دەبن و لە ئەنجامدا تەفاهوم دەکەن کە هەردوو لایان نامە بۆ سەرکردایەتی خۆیان بنووسن بە ئیتجاهی تەفاهوم و چارەسەر کردنی گیروگرفتەکە لەو کاتەدا یەکێک لە پێشمەرگەکانی سەر بە برایانی یەکیەتی دەست دەکات بە هەڕەشەو قسە کردن و مەوزوعەکە دەکاتە هی خۆی و دەست

دەبات بۆ چەک و دەبێتە تەقە. لە ئەنجامدا دوو پێشمەرگەی ئێمەو دوو پێشمەرگەی برایانی یەکیەتی شەهید دەبن و یەکێکی خەڵکی گوندەکەش شەهید دەبێت. ئێمە بە بیستنی هەواڵەکە زۆر نارەحەت بووین و خۆمان داوای لێکۆڵینەوەو تەحقیقمان کرد بەڵام برایانی یەکیەتی وەختێک کەوا هەستیان کرد کەوا برادەری ئەوان دەست پێشکەر بووەو لێکۆڵینەوە لە بەرژەوەندیان نیەو خۆیان لیَ بوارد.

(٤) دەربارەی ڕوداوی عازەبان برایانی یەکێتی باسیان کردوە، کەوا ئەو تاوانە لە دژی ئەوان کراوە... بەڵام ڕاستیەکەی ئەو تاوانە دژی حزبمان کراوەو لەلایەک خائن ڕەئوف زەڕایەنی و بۆ میری کراوەو ناوبراو ئێستا جاشی میرییە...

(٥) دەربارەی ئازاد خۆشناو هەروەکو لە بەیانەکەدا ئیعتراف دەکەن کەوا ئێمە داوای لێکۆڵینەوەمان کرد بەڵام ئەوان لەسەر ئەوەی کە گوایە ناوبراو فەرمانی کوشتنی بۆ دەرچووە لەلایەن پێشمەرگەکانیانەوە دادگای شۆڕشگێڕی دەکرێ. خستیانە پشت بەڵام پاش ئەوە چەند نووسراوێکی لێپرسراوەکانیان لامانە کە بۆ ئازاد خۆشناویان ناردووە داوای گەڕانەوەی دەکەن کە بچێتەوە لایان و ناوبراو بە پاک و دڵسۆز دەدەنە قەڵەم.

(٦) باسی ڕوداوی دەشتی هەولێر دەکەن بەڵام نەیانوێراوە مێژووەکەی بنوسن. بەڵی بە گوێرەی مەعلوماتێک کە پێمان گەیشتوە لە کۆمیتەی سەرکردایەتی هەولێرەوە پێشمەرگەکانی هەرێمی (١٥) کە لە دەشتی کۆیە ڕۆژی ١١/٢٢ دا مەفرەزەیەکی (١٢) پێشمەرگەییان بە دەستی چەکدارەکانی یەکێتی چەک دەکرێن. وە لە ڕۆژی ١١/٢٨ دا وەکو کاردانەوەیەکی ئەو کارە ناشۆڕشگێڕییەی دژیان کراوە بەبێ فەرمانی سەرکردایەتی مەفرەزەیەکی سەر بە یەکێتی نیشتیمانی چەک دەکەن کە ژمارەیان ٧ کەس بوون و لێپرساوی مەفرەزەکەش بە بارمتە دەگرن، لەبەر سەلامەتی ژیانی هەڤاڵ کاکەسوور کە بە هەڕەشەی کوشتنەوە ڕەوانەی سەرکردایەتی خۆیان کردوە وە ئێستا لەویَ بەندە.

(٧) دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی گوندەکان کە لە یەک

لایەنی لەلایەن برادەرانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە شێوەی دانان و تەعین نەک هەڵبژاردن لە گوندەکاندا وەکو پەیڕەوی کردن لە گیانی دەسەڵاتداری دادەنرێت. هەڤاڵانی ئێمەو حزبی شیوعی و پاسۆک پێیان قایل نەبوین وە داوامان ئەوە بوو کە بە هەڵبژاردن لەلایەن دانیشتوانی گوندەکانەوە بێت بەبێ دەست تێوەردان و خۆ فەرز کردنی هیچ لایەک لە ئەنجامدا فەرماندەی مەڵبەندی دووەمی سەر بە یەکێتی لەگەڵ نوێنەرانی حزبمان و حزبی شیوعی لە گوندی مالومە کۆبونەوە دەکەن و پاش مناقەشە هەڤالان بیرو ڕای ئێمە سەبارەت بە هەڵبژاردن پەسەند دەکەن و ڕێکەوتننامەیەکیش بۆ ئەو مەبەستە ئیمزا دەکەن.

جەماوەری خەڵکی کوردستانی شۆڕشگێڕ.. برایانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە بەیانەکەیاندا زاتی ئەوەیان نەکردوە کە باسی هۆیە ڕاستەقینەکانی ناتەبایی و شەڕو ئاژاوەو گیروگرفتەکانی ئەم چەند ساڵەی نێوان باڵەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی بکەن چونکە دڵسۆزو جدی نین بۆ نەهێشتنی ئەو بارە نالەبارەی کە هەر تەنها دوژمن سودی لێ وەرگرتوە. بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە کەوا بە شێوەیەکی تاکتیکی و بەڕواڵەت لێپرسراویەتی ئەو وەزعە ناوخۆیە لەسەر خۆیان لابدەن.

بۆیە ئێمە لێرەدا کە زۆر مەبەستمانە و دڵسۆزانە لە هەوڵی نەهێشتنی ئەو وەزعەو دابین کردنی زەمینەیەکی گونجاو بۆ پەیوەندیەکانی نیشتیمانی و مسۆگەر کردنی هاوخەباتی ڕاستەقینە دژی ڕژێمی فاشی و لەپێناو دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی ئیئتلافی و ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینەدان، بە پێویستی دەزانین هۆیە بنچینەییەکانی شەڕی برا کوژی و ئاژاوەی ناوخۆ باس بکەین و هەموو لایەک پێکەوە هەوڵی لابەلاکردن و نەهێشتنیان بدەین بە خەباتی یەکگرتوی جەماوەری گەلەکەمان و هێزە نیشتیمانیەکانی، تاکو ئیرادەی خۆمان فەرز بکەین لە باشترین شێوەی ژیانی دیموکراتیدا.

١- بونی جیاوازی بیروڕاو خیلافی سیاسی لەنێوان هێزە

نیشـتیمانیەکاندا -کە ئەمەش شـتێکی سروشـتیە لە جەوی سیاسـی و دیموکراتیا هۆکاری هێزو ئیجابیەتە- بەڵام شێوەی تێگەیشتن و ڕەفتار لەگەڵ کردنـی لە حـزبێکەوە دەگۆڕێت بـۆ حزبێکـی تـر. ئـێمە لەگەڵ برایانی یەکێتی نیشتیمانی لەڕووی فیکری و سیاسیەوە جیاوازیمان هەیە هەر وەکو لەگەڵ برایانی حزبی شیوعی و پاسۆک و پارتیش هەمانە. بەڵام زۆر خاڵی هاوبەشیشمان هەیەو لەسەر مەسەلەی ئەساس کە ئەویش ڕوخانـدنی ڕژێـم و دامەزرانـدنی ڕژێمێکـی دیمـوکراتی و هێنـانەدی ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کوردستان خیلافمان نیە. بۆیە ئێمە گیروگرفت و خیلافەکـانی تـر لەم قۆنـاغەدا بە شـتێکی لاوەکـی و خیلافـاتی نـاو ڕیزەکانی گەل دەزانین کە دەبێ بە ڕێ و شوێنی دیموکراتیانەو وتووێژی برایـانە چارەسـەر بکـرێن. هـیچ کاتێـک لە تەحلیـل و هەڵسـەنگاندنەکان یەکێتی نیشتیمانیمان بە هێزێکی دوژمن و نانیشتیمانی دانەناوە، کەوابوو نە مافمان بەخۆمان داوەو نە پێشمەرگەو کادرەکانمان فێر کردووە بەچاوی دوژمنـایەتی سـەیریان بکەیـن و ڕەفتاریـان لەگەڵا بکەیـن. بە پـێچەوانە هەوڵی دامەزراندنی پەیوەندی دۆستایەتی و هاوخەباتیمان داوە لەگەڵیان ئەمەش کۆنگرەی یەکەمی حزبمان بڕیاری داوە. بەڵام برایانی یەکێتی نیشـتیمانی لە هەڵسـەنگاندنەکانیان زۆرجـار ئـێمەو لایەنەکـانی تریـان لە خـانەی دوژمنـان و دەرەوەی ڕیـزی نیشـتیمانی دانـاوە. ئەم بۆچـوون و هەڵسـەنگاندنە چەوتـانەش ڕایکێشـاون بـۆ ئەوەی ڕەفتـاری دوژمنانەمـان لەگەڵـدا بـکەن. وەکـو لە نـامیلکەی (جـۆش و خرۆشـی خەبـات) و نامیلکەی (یەکێتی نیشتیمانی بۆچی)دا دەردەکەوێ.

٢- کەلـکەلەی تـاکە حزبـی و سـەرکردە: ئـێمە زۆرجـار تەئکیـدمان کـردۆتەوەو بە ڕەفتـاری ڕۆژانەش سـەلماندومانە کە خۆمـان بە بـاڵێکی بـزوتنەوەی ڕزگـاریخوازی گەلـی کـورد دەزانـین و ڕێـزیش بـۆ خەبـاتی هەمـوو لایەنە کوردسـتانیەکان دادەنێین و حەز بە برایەتـی و هاوخەباتیـان دەکەیـن و لەگەڵ چەنـد لایەنێکیـان لەنـاو (جـود)دا باشـترین پەیوەنـدی برایانەو هاوخەباتیمان هەیە. وە ساحەی کوردستان بە مەڵبەندی خەباتی

هەموو نیشتیمانپەروەران و تێکۆشەرانی کورد دەزانین و بە چاوی سوک تەماشای هیچ ڕێکخراوێک ناکەین. بەڵام برایانی یەکێتی نیشتیمانی وەکو لەبیرکردنەوەی سیاسی و هەڵوێستیشیاندا دەبینرێ خۆیان بە تاکە حزب و تاکە سواری مەیدان دەزانن و بەچاوی ىێ بایەخی و سوکیەوە تەماشای هێزە کوردیەکانی تر دەکەن و لەو شوێنانەی بۆیان بکرێ ڕێگای چالاکی لایەنەکانی تر دەبەستن و بروایان بە گیانی دیموکراتی و بەرەیی زۆر لاوازەو تەنها حسابی هێزو دەسەڵاتی ڕۆژ دەکەن.

٣- پاشماوی دوژمنایەتی مێژووی کۆن:

ئێمە وەکو حزبی سۆسیالیستی کوردستان کە خۆمان بە حزبێکی نوێ و هەڵگری بیرو باوەڕی سۆسیالیستی زانستی دەزانین، هەر لە سەرەتاوە ڕامان گەیاندوە کەوا ئێمە خۆمان بە میراتگری لایەنە سلبیەکانی کۆنی شۆڕشی ئەیلول و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد نازانین و بە چاوێکی زانستیانەو مەوزوعیانە بە دەرس وەرگرتن نەک بۆ تانەو لۆمە، باسی هەڵەو لادان و تەجروبە دژوارەکانی ڕابوردو دەکەین.

٤- بونی تەئسیری دەوروپشت و سیاسەتی محوەرەکان، ئەمەش زۆر جار تەئسیری خۆی هەیە ، حزبمان کە ئیستقلالیەتی خۆی بە هەموو نرخێک پاراستوە هیچ کاتێک خۆی تێکەڵاوی میحوەرەکانی دەورو پشت نەکردوە.

٥- جێگا بونەوەی دەست و تاقمی خاوەن بەرژەوەندی تایبەتی، یان گومان لێکراو لەناو بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی کە بە هەموو شێوەیەک هەوڵ دەدەن ئالۆزی و ئاشوبی بڵاوبکەنەوەو لە خیلافاتی حزبەکان کەڵک وەربگرن و بەرژەوەندیەکانی خۆیان بپارێزن و نەخشە گڵاوەکانی دوژمن جێ بەجێ بکەن. ئێمە لێرەدا ئەم خاڵە بۆ جەماوەری کوردستان بەجێ دێلین کەوا حوکمی دادپەروەرانەی خۆیان بەسەردا بدەن.

برایانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئەگەر جدی بن و بە دڵسۆزیەوە بیانەوێ بۆ زەمینەی برایەتی و هاوکاری لەگەڵ هێزە نیشتیمانیەکان بگەڕێن، دەبێ بە جورئەتی شۆڕشگێڕانە ئەو ڕۆحیەت و

بیرکردنەوەو بۆچونە سیاسیانەی سەرەوە بدەنە تیشکی بیرو باوەڕی زانستی و بە چاوی ڕەخنەگرانەی مەوزوعیەوە هەڵوێستیان لێ دیاری بکەن.

هاونیشتیمانیانی بەڕێز:

ئێمە لەکاتێکدا ئەو ڕاستیانەی سەرەوە باس دەکەین مەبەستمان نیە ئاڵۆزی زیاد بکەین و لایەنی تەبایی بەلاوە بنێین بەڵکو زیاتر لە پەرۆشی و هەست کردن بە مەسئولیەتی مێژوویمانە بۆ ئەوەی نەخۆشیەکانمان و هۆیەکانی و شێوەی چارەسەر کردنیان بدۆزینەوەو زەمینەیەکی پتەو دابین بکەین بۆ خەباتی یەکگرتوی هێزە نیشتیمانیەکانی کوردستانی و عێراقی. وە لابەلا کردن و چارەسەر کردنی گیروگرفت و خیلافاتەکان و دابین کردنی گیانی برایەتی و تەبایی و هاوکاری لەگەڵ برایانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەڕێگەی سیاسی و گفتوگۆی دیموکراتیانەو هێمنانەو برایانە وە بە ڕێگەی تەحقیق و لێکۆڵینەوە، بە بەشداری هێزە نیشتیمانیەکانی تری عێراق و کوردستان وە بە بەشداری نوێنەرانی خەڵکی کوردستان لەو ناوچانەی کە ڕوداوەکانی تێدا قەوماوە. وە بەلای ئێمەوە باشترین سەرەتاو چوارچێوە کە برایەتی و هاوخەباتی توندو پتەومان بۆ مسۆگەر دەکات ئەمانەی خوارەوەیە:

١- یەکیەتی هەڵوێست لە ڕژێمی فاشی بەغداو تەئکید کردنەوە لەسەر خەباتی شۆڕشگێڕی تاکو ڕوخاندنی ئەو ڕژێمە تاوانبارەو بەدی هێنانی دروشمی خەباتی ناوکۆیمان کەوا دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی ئیئتیلافیە بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کوردستان.

٢- سەلماندنی مافی ئازادی چالاکی سیاسی و عەسکەری لە هەموو کوردستاندا بۆ هەموو هێزە نیشتیمانیەکان. ٣- چارەسەرکردنی گیروگرفت و خیلافاتی سیاسی لە ڕێگەی وتوویژی برایانەو ڕێ و شوێنی دیموکراتیانە و هێمنانە لەڕێگەی تەحقیق و لێکۆڵینەوەی هاوبەش و چەند قۆڵی و بە بەشداری نوێنەرانی خەڵکی ناوچەکان.

٤- هاوکاری سیاسی و عەسکەری و ئیعلامی و جەماوەری دوو

قـۆڵی و هەمەلایەن وەکـو سـەرەتایەک بـۆ زەمیـنە خـۆش کـردن بـۆ پێکهێنـانی بەرەی نیشـتیمانی عێراقـی فـراوان کە هەمـوو هێـزە نیشتیمانیەکانی کوردستانی و عێراقی تێدا بەشدار بن بۆ پەلە کردن لە ڕوخاندنی ڕژێمی ڕوو لە هەرەس هێنانی فاشی بەغدا.

ئـێمە جـارێکی دیـکەش ئامـادەیی برایەتـی یەکێتـی نیشـتیمانی کوردستان بۆ چارەسەری هەموو گیروگرفت و ناکۆکیەکان پێشوازی لێ دەکەین و ئامادەیی خۆمان تەئکید دەکەینەوەو ڕادەگەیەنین کەوا هێزە نیشـتیمانیەکان و جەمـاوەری کوردسـتان لەلایەن ئـێمەوە ڕێ ڕوون بـن و ئامـادەبن هەرچی زووتـرە هەنگـاو هەڵبگیرێت بۆ نەهێشتنی هەر جۆرە ئـاڵۆزیەک و کـردنەوەی لاپەڕەیەکـی تـازەی برایەتـی و تەبـایی و هاوخەباتی.

**مەکتەبی سیاسی**

**حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق**

**١٩٨٣/٢/٦.**

# بۆ ئەوەی

# راستییەکان لە جەماوەر

# وون نەبێ

لە بڵاوکراوەکانی

حزبی سوسیالیستی کوردستان

عێراق

لە رۆژی ١٩٨٣/٢/٤دا بە بەیانیکی کومیتەی سەرکردایەتی یەکیتی نیشتمانی کوردستان لە ئیستگەکەیانەوە بلاوکرایەوە، کە تیایدا باسی چەند رووداویک دەکەن لە زنجیرەی ئەو کومەلە رووداوانەی کە لە نیوان هیزەکانی حزبمان و هیزەکانی جود لە لایەک و هیزەکانی یەکیتی نیشتمانی لە لایەکی تر قەوماون لە وەتای شەری براکوژی سالی پاری نیوان یەکیتی و لایەنەکانی تر وەستاوە تاکو ئیستا.

برایانی یەکیتی نیشتمانی وایان دەرخستووە کە وا هیزەکانی حزبمان لەو رووداوانەدا دەستپیشکەر بوون و شەریان فروشتووە پییان و لیپرسراوانی حزبمان بە هەندی دزو دەستڕەش و تاقمی گومان لیکراو دەداتە قەلەم و بە قسەی ئەوان هەول دەدەن لە ریگای رووداوی دروستکراو بە پەلپ و بیانوی ناراستەوە دیسان شەری براکوژی هەلگیرسینن و جولانەوەی گەلەکەمان لە شاریی ئاسایی خوی لابدەن و سەر لە نوی کوردستان بکەنەوە مەیدانی کورد بە کورد بەکوشتدان. !! گوایە هیزەکانی ئەوان ئەگەرچی غەدریشیان لیکراوە و بە لامار دراون بەلام لە پیناو پەکخستنی پلانی بەکوردی کردنی شەر دانیان بە خویاندا گرتوە و پەنایان نەبردوتە بەر وەلامدانەوە و بەکارهینانی چەک و بگرە لیکولینەوەو

- ١ -

وتوویژی برایانە و دیموکراتیانەیان گرتوتە بەر بەلام لەگەل ئەوەشدا سەرکردایەتی حزبی سوسیالیستی کوردستان ئارەزووی جدییان پیشان نەداوە و ملیان نەداوەتە تەبایی و بە ناهەق لەسەر سیاسەتی شەرفروشتن و هەلگیرسانەوەی شەری ناوخویی بەردەوام بوون ... لە کوتایی بەیانەکەدا لە کاتیکدا بە شیوەیەکی ناراستەوخو لە ریگای جولاندنی عاتیفەی ساکاری چەکدارەکانیان بە ناوی دیفاعەوە هەول دەدەن بو بەگژاچوونی پیشمەرگە قارەمانەکانی حزبمان، لە هەمان کاتدا بو زیاتر شیواندنی راستەقینەکان، رادەگەیەنن کە وا ئەم جارەش وەکو هەموو جاریک یەکیتی نیشتمانی ئامادەیی تەواوی خوی دەربری بو چارەسەر کردنی هەموو گیروگرفت و ناکوکیەک لەگەل حزبی سوسیالیست یان هەر هیزیکی کوردی تر بە ریگای سیاسی و گفتوگوی هیمنانە و لەسەر بنچینەی لیکولینەوەی چەند قولینەوە. هەروەها بانگەوازی جەماوەری کوردستان دەکەن کە وا زەخت لە حزبمان بکات بو ئەوەی لە جیاتی ریگای بەکارهینانی چەک و کوشتن، ریگەی سیاسی و گفتوگوی هیمنانە هەلبژیرن بو چارەسەر کردنی کیشە و گیروگرفتەکان ...

هاونیشتمانیانی بەریز .. جەماوەری کوردستانی راپەریو .. ئیوە زور باش

- ٢ -

دەزانن و لیتان روونە و شاهیدی ئەو رووداوەکان بوون. ئەم جارە یەکیتی نیشتمانی کوردستان چونە کەولی مەرەوەی دەیانەوی لە ریگای محکمە و بی سەلماندنەوە گوشتی مەرەکە بخون. ئەم جارە لە ژیر ناوی پەکخستنی شەری براکوژی و کورداندنی شەرەکە دەیانەوی پەلامار بدەن، بیانووش گوراوە بەلام مەبەست هەر وەکو خویەتی. ئیوە لاتان روونە و ئاشکرایە کە حزبی سوسیالیستی کوردستان تاکو ئیستا لە گەمارودان و هیرش و پردانە ئیعلامیەکانی بەردەوامی یەکیتی نیشتمانی بی دەنگ بووە و گویی نەداوەتی، ئەوەش بە گویرەی تاکتیک و ری و رەسمیکی تایبەتیەوە بووە کە بو یەکەم جار لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردمان پەیرەوی کراوە. چونکە موهاتەرات و شەرە قسە و تومەت و تاوان دانە پال یەکتری لە نیوان بالەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی لە رابردووشدا لە مەوقیعی جیاوازەوە ئەوەندە نامەوزوعی و ناراست و کەم تەمەن بوون ئەوەندە هەر مایەی قیزی خەلکی کوردستان بوون بەلکو چەکیکی کاریگەری دەستی دوژمنان بوون بو رەش پیشاندانی سەروەرییەکانیشمان.

حزبمان وەکو بروایەکی بەو سەرەتایەی کە بواری ئەوەندە سەخت و دژوار دینەکایەوە لە ریرەوی خەباتە نوییەکەماندا،

- ٣ -

هەویەی هەموو حزبەکان و رادەی دلسوزی و راستگویی و ماهیەتی راستەقینەیان بە تەواوی دەردەکەوی و دەناسرین ئەگەر دەیان هەویەی ساختە و شیوەی ماکیاج و قیافەت بەکاربهینن چونکە جەماوەری کوردستان ئەوەندە گویی لە قسەی ریک و پیک و نەخشاو بووە و ئەوەندەی رەفتاری چەوت و چەویلە دیوە، هیندە یاری بە چارەنووس کراوە و پەنجەی کراوە بە زاخا ئیتر ئاسان نیە ئیعلام و راگەیاندنی دیماگوگیانە راستیەکانی لی وون بکات، تازە بروا بە هەموو قەوانی و ئاوازیک ناکات، دوست و دوژمنەکانی باش ناسیوە، هیزە شورشگیرە دلسوزەکانی باش ناسیوە و خەریکە زورە شورشگیر و راپەرانی شورشی چەواشەش دەناسی. جەماوەری کوردستان کە لە ناو زەبروزەنگ و کوشتن و برینی رژیمی فاشی دەستبەرداری ئامانجەکانی نابیت و قارەمانانە راپەری و بەگژ جەللادە پیاوکوژەکاندا دەچیتەوە و بە خوینی گەش و ئالی شەقام و بازارەکانی شار و گوندەکانی دەنەخشینی و لە ژیر باری ئیعلامی فاشیانە بەرچاو روونانە سەر دەردەکات و پیلان و مانورەکانی رژیم ریسوا دەکات و ریگای خەبات بزر ناکات. خەلکی کوردستان دیارە روژانە چەند جاریک سروشتی ئیعلامی رژیم دەبینن کاتیک کە هەوالی راپەرین و خوپیشاندانەکان کە

- ٤ -

دەیان رۆڵەی قارەمان تێدا شەهید ئەبن
کەچی بۆ ئێوارە لە ئێستگەی رژێمـــــەوە
ئەبیستری کەوا جەماوەری قەلادزە یـــان
سلێمانی یان هەولێر راپەریـــــون و
خۆپیشاندانیان کردووە بۆ پشتیوانی کردنی
قادسیەی صدام و موبایعە کردن بە خوێـــن
بۆ سەرۆکی پێشەوا صدام حسین . بەڵـــێ
جەماوەری گەلەکەمان کە لەبۆتەی خەباتی
سەختدا قاڵ بوتەوە و سەلیقەی شۆڕشگێـــری
بەو ئەندازە بەرز بوتەوە بـــە کردار و
هەڵوێستە شۆڕشگێڕیەکانەوە نەک بەئیعلام و
قسەی رەنگاو رەنگ هەڵوێستی هـــــێزە
سیاسیەکان سەرنج ئەداو هەڵی ئەسەنگێنێو
رادەی راستگۆیی و دڵسۆزی هەریەکەیان بۆ
بەرژەوەندی بەرزی خەباتی گەلەکەمـــان
تێئەگاو دروشمە رەسەنە نەگۆڕاوەکان لـــە
دروشمە سپاتەکان لەیەک جیا ئەکاتـــەوە .
. حزبمان هەر لەم سیقەو بڕوا بــــەرزە
بەخۆی و بە جەماوەری گەلەکەمان خـــۆی
بەرەتدانەوەی ئەم هەموو پڕوپاگەنـــدەو
تۆمەت و بوختانە ئیعلامیانەی یەکێتـــی
نیشتمانی خەریک نەکردوە ، کە راستەوخۆ
یان ناراستەوخۆ هیچ وشەو رستەیەکـــی
ناحەزو دزێو نەماوە کە دژی حزبمـــان
بەکاری نەهێنابێ ، هیچ تۆمەت و نـــاوو
ناتۆرەی سیاسی و تەنانەت بازاڕیش نەماوە



نەیان دابێتە پاڵ حزبمان ، لە وتارەکانی
ئێستگەکەیان و نوسین و بڵاوکراوە و نامیلکە
ـ کانییان و لە کۆڕو کۆبونەوە وسیمینارەکانیا
لەناو جەماوەرو لە ریزەکانی خۆیـــان و
تەنانەت هەتا لەناو دۆستەکانی خەباتـــی
گەلی کوردیشماندا لەدەرەوەی وڵات .
کاتێک لە سەرەتای هەڵگیرسانەوەی شۆڕشە
دیموکراتیە عیراقیەکەمان ، حزبمـــان بۆ
رابەری خەباتەکەمان بۆ روخاندنی رژێمی
فاشی بەغدا و دامەزراندنی رژێمێکـــــی
دیموکراتی لە عیراقدا داوای پێکهێنانـــی
بەرەی نیشتمانی عیراقی فراوان و بە عیراقی
کردنی شۆڕشی ئەکرد پەنەیان راپۆریان
لێ ئەنوسین بۆ دوژمنەکانی دەرەوەمـــان و
بەناهەق تۆمەتیان بۆ دروست کردین کـــە
گوایە ئێمە هێزێکی نەتەوەیی تالەرەوین و
حەز ناکەین شۆڕشەکە ببێتە عیراقـــی ..!
کاتێک حزبمان دروشمی هاوپەیمانیەتـــی
بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردو حـــزبی
شیوعی عیراقی بەرز کردەوە کەوتنە لێدانی
قەوانی ئەوەی کە ئێمە بوینە شـــیوعی و
پاشکۆی شیوعیەکان . کاتێک دژی شەری برا
کوژی وەستاین و داوای یەکخستنی خەباتـــی
هێزە کوردیەکانمان کرد ... تاوانـــی
هاوکاری پارتی و بەقسەی ئەوان قیادەی
موەقەتەیان دایە پاڵ کەوا ئێمە هـــەوڵ
ئەدەین ئەوانە بێنەوە ریزی نیشتمانـــی



لە کاتێکدا کە ئەوان هێزێکی (کۆنەپەرست و
خۆفرۆشن) .
کاتێک لەگەڵ حزبی شیوعی و پارتی بەرەی
نیشتمانی دیموکراتی عیراقی (جـــود)مـــان
مۆر کرد کەوتنە پەلاماردان و بە دەستـــی
(ریگان)ی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانـــی
ئەمریکایان دایانە قەڵەم . ئەوە هیچ خـــۆ
ئەیان جار بە پڕوپاگەندە و بە خەیـــاڵ
حزبەکەمانیان لێکهەڵوەشاندەوە و دابەشیان
کردوین . پاشان ئەوە بوو بەناهەق و لـــە
خۆتوخۆرایی شەری قەلاچۆکردن و پاکتاوکردنی
عەسکەریان بەسەرماندا سەپاندو بەبێ ئەوەی
ئاگادار ببین هەڵیان کوتایە سەر بارەگاکانمان
و رۆڵە هەڵکەوتوەکانی وەکو شەهید شێرکـــۆ
شێخ علی و عبداللە سوور و مامۆستا شریف و
مام شاراس و حسن وەرتی و دەیان پێشمەرگە
و کادریان لێ شەهید کردین بە نـــاوی
میواندارى و بەغەدر . خۆ ئەو کاتەش هـــەر
پیلانی کورداندنی شەرمان نەدەگێرا ....!!
کاتێک لەگەڵ پارتی پێک هاتنـــــەوە و
رێکەوتنیان ئیمزا کرد ئەم جارە گوتیـــان
یەکێتی نیشتمانی نوێنەری کرێکـــارانی
کوردستانە و پارتیش نوێنەری بورجـــوازی
نیشتمانیە ، ئیتر پێویست ناکات و نابێت
حزبی سوسیالیست و حزبی شیوعی و پاســـۆک
ببینن و خانەیان نیەو ئەیان توێنینەوە ..
لە هەموو ئەو تۆمەت و تاوانانەی دایانە



پاڵمان هەموو جاری خوێنمان حەلال کـــراوە
خۆ مەوزوعی بەدناو کردن و شێواندنـــی
ناوبانگی شۆڕشگێری حزبمان و کەم کردنەوەی
قورسایی و قەوارەو سەروەریەکانمـــان
بەرادەیەک بوە هەتا شەهیدەکانیشمـــانی
گرتوتـــەوە .
کاتێک لەلایەن پێشمەرگە قارەمانەکانمانەوە
چەند خەبیرێکی بێگانە کە بـــۆ پـــرۆژە
سەربازیەکانی رژێم کاریان ئەکرد لـــە
ناوچەی قەرەچوغی نزیک تکریت دەسگیرکران
لەناو جەماوەر بڵاویان کردەوە کەوا چەند
کرێکارێک گیراوە ، وە لە رادیۆکەشیـــان
لەبەر خاتری سۆشیال دیموکراتەکان بڵاویان
کردەوە کەوا هەندێک (کوردی نـــــەزان
عولەمای فەرنساوی ئەفرێنن و داریـــان پێ
ئەشکێنن) ... بەوەشەوە رانەوەستاون، بـــۆ
خۆیان هەرچی رەفتارێکی ناشۆڕشگێرانەیان
کردبێ گورج داویانەتە پاڵ پێشمەرگەکانی
حزبمان ، وەکو جەماوەری کوردستان ئەزانن
کی سەرانەو تراکتۆرانەو فەرمانبەرانـــەو
سەربازانەو تەلەفزیۆنانەیان لێ وەرئەگری،
وەکو لایەنەکانی کوردستان ئاگادار ئەبن
کەوا چەند جار لەلایەن ئێمەوە هاوڵاتیانێ
نێردراون بۆ وەرگرتنەوەی پارەی خەڵکـــی
رووت کراوە لەدەورو پشتی بارەگاکانیـــان،
وەکو بەدەیان نامەیان لای هاووڵاتیان ئەبیت
کە کردویانەتە سەریان بۆ پارە ، دیـــارە

ئەوەیان لەبیر چوتەوە کە مەکتەبی عەسکەریان روون کردنەوەیەکی دەرکردووە بو هاوولاتییان کەوا خەلکی بەناوی پیشمەرگەی ئەوانەوە راوو رووت دەکەن بیان ناسن...

ناوو ناتورەکانیان هیندە نزم بووە گەیشتە ئەو رادەیەی کەوا چەند جاریک لە وتاری سیاسی و لە ئیستگەکەیاندا بلاوی بکەنەوە کەوا حزبی سوسیالیست بەلینوقورچکی لە دوژمن نەداوە!! ئەو هەموو درۆو بوختانە شاخدارانە .. ئەو هەموو ناوو ناتورە بی ماناو بی بنچینانە ..کە جەماوەری کوردستان نەیان جار گوییان لی بووە و لە رەفتاری روژانەی لیپرسراوانی یەکیتی نیشتمانی دیویانەو پاشان بویان ساغ بوتەوە کە هیچی لە جیگای خوی نەبوەو بەپیچەوانەی راستەقینەوە بون . جەماوەری کوردستان ئیستا پرسیاریکی سادەو ساکار ئاراستەی یەکیتی نیشتمانی دەکان . ئەگەر راست دەکەن ئیوە بڕواتان بەژیانی دیموکراتی هەیە و جەماوەری کوردستان پشتگیری سیاسەتەکەتان دەکات و حزبی سوسیالیستی کوردستان هیچ دەورو جەماوەری نیە ئیتر بوچی هیندە خوتانی پیوە خەریک دەکەن، خو دەنگدانیکی ئازادو دیموکراتیانەی سەر گورەپانی خەبات بەسە بو ئەوەی ببینە تاکە سواری مەیدانو سەرکردایەتی خەباتی گەلی کورد بکەن ، ئیتر چی پیویست دەکات



بەشەرو کوشتارو قەلاچوکردنی خەلک ؟!

هاوولاتییانی بەریز .. ئیمە کە ئەم جارە ناچارین لە بەیاننامەکەی یەکیتی نیشتمانی کوردستان بەدەنگ بیینو وەلام بدەینەوەو راستیەکان باس بکەینو پیکەوە مناقشەیەکی هیمنانەی خالەکانی ئەو بەیاننامەیە بکەین، لەبەر ئەوە نیە کە گومانمان هەبیت لە راستیەوە نزیک بن یان گومانمان هەبیت کەس بڕوایان پی دەکات بەلکو بو ئەوەیە جەماوەری گەلەکەمان لە شیوەیەکی تازە بابەتی پەلپ و بیانوی شەر فروشتنی یەکیتی نیشتمانی ئاگادار بکەینو هویە راستەقینەکانی ئەم پیلانەشیان بو ئاشکرا بکەین تاکو هەموو لایەک پیکەوە بەرچاو روونی تەواوەوە هەولی لەبار چواندنو پوچکردنەوەی بدەین. وە بەم خالانەی خوارەوە هەندی شت روون دەکەینەوە کە تیایدا وەزعی ناسکی ئیستای خەباتەکەمان دەردەخەینو هەندی پیلانەکانی رژیمیش دەخەینە بەر چاوی جەماوەری گەلەکەمان :

١ـ پیلانو مانورەکانی رژیمی فاشی بەعسی عەفلەقی بەغدا بو بەگژا یەکدانی هیزە نیشتمانیەکانی کوردستانو بەکوردی کردنی شەر ، ماوەیەکە بەئاشکرا دریژەی هەیە لەژیر ناوی سەوداو سەوداکاری و پیکهاتن لەگەل هەندی (لایەنی کوردی) بە قسەی



روژنامەی عیراق کە لە روژی ١٩٨٢/١٢/١٨ دا بلاوی کردوتەوە گوایە (هەندی لایەن ئامادەیی خویان پیشان داوە کە لەگەل رژیم هاوکاری بکەن) . وە دەستگای ئەمن و ئیستخبارات و خوفروشەکانی رژیمیش دنیایا پر کردبوو لەو جورە دەنگ و باسانەو جەماوەری کوردستانیش گوییان لی بووە و زوریش لەو بابەتە قسانەی بیستوە کە هەراسانی و ناڕەزایی و هەندیک جاریش وشیارییان داوەتە حزبمانو لایەنەکانی جود.

٢ـ بارو دوخی ئیستای خەباتی گەلەکەمان لە وەزعیکی زور ناسک و میژوویدایەو هیزە شورشگیرە دلسوزەکان لە هەموو کاتیک زیاتر مەسئولیەت رووبان تی دەکاتو پیویستە لە هەموو کاتیک زیاتر دان بەخویاندا بگرن و پشوو دریژ بن بەگردەوەی خونەویستی ؟ فیداکاری زیاتر نیشان بدەن بو پوچ کردنەوەی بتشکاندنی نەخشە و پیلانە گلاوەکانی رژیم .

٣ـ جەماوەری کوردستان کە هەمیشە بە سەلیقەی شورشگیری زیانەکانی شەری برا کوژی لەبەر چاو بوە و زور بیوەی هەراسان بوە ، لەم کاتەدا چاوەروانی یەکبوون و دەرکیز کردنە سەر رژیمی فاشی دەکات وە هەر لایەنیک گەوجانە یاری بەو ئاگرە بکاتەوە ، تەئسیریکی زور سلبی دەبیت لەسەر وورەی جەماوەرو سارد کردنەوەو



چەک گیروگرفتەکانمان لەگەل یەکیتی نیشتمانی کوردستان لابەلا بکەین . بەلام هەر ئیمە بوین کە ئەو گەلەکەوەو خەبالەمان گور کرد ؛ گوایە دەتوانری لە ریگای کوشتنو برینی گیروگرفتەکان چارەسەر بکرین.وە بە خەباتی ناوکویی ئیمەو هاوپەیمانەکانمان بوو کە سەر ئەنجام مەنتیقی کوتەک و زورە ملیمان تیکشکاندو سەلماندمان کە تاکە ریگای چارەسەر کردنی گیروگرفتەکان تەنها وتوویژی برایانە بینە کە پاش چەند کوشش و هەول و تەقەلای دلسوزانە شەری برا کوژی لە نیوان یەکیتی نیشتمانی کوردستانو هەموو لایەنەکانی تری سەر گورەپانی خەبات وەستاو خەلکی کوردستانیش زور شادمان بونو بە سەرەتای سەرکەوتنیان دانا .

٥ـ لە کوبونەوەی ئەم دواییەی لیژنەی بالای بەرەی نیشتمانی (جود) جاریکی دیکەش تەئکید کرایەوە لەسەر سیاسەتی تەبایی و کەم کردنەوەی ئالوزی نیوان هیزەکانی جود و یەکیتی نیشتمانی وە لەم ماوەیەدا زور جهودی هاوبەش و دلسوزانە سەرف کراوە وە ئەوەی لە توانادا بووە کراوە بو ئەوەی ریگا لەباری ئالوز ببڕدریتەوە وە نەك هەر ئیمە گلەیی و گازەندەمان هەبووە لە دەست چەکدارەکانی یەکیتی نیشتمانی کوردستان بەلکو هەموو

لەبار چواندنی جۆش و خرۆشی شۆڕشگێڕانەیان.

٤ـ حزبی سۆسیالیستی کوردستان هەمیشە شانازی بەوە کردوە کە لەپێشەوەی هەڵگرانی ئاڵای تەبایی و برایەتی وهاوخەباتی بوە و لەو پێناوەدا وا هەست ئەکات زۆر لە خۆبوردنی کردوە و کاتێك کە بەرژەوەندی بەرزی خەباتی یەکگرتوی میللەت پێویستی کردبێت دانی بەخۆیدا گرتوە و تەنانەت لەسەر خوێن و لاشەی ئەهێنە بە ناهەق کوژراوەکانیشیدا دەستی لێبوردن و برایەتی درێژ کردوە. وە لەناو چوار چێوەی بەرەی نیشتمانی دیموکراتی، هاوکاری هاوپەیمانەکانی زۆر جار فریای ئەوە کەوتوە کە نەهێڵێ شەڕی براکوژی لەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستاندا ڕوو بدات، وا بزانین برایانی یەکێتی خۆیان زۆر نمونەیان لەم بارەوە لەبەر چاوە.

وە هەر لەم ڕۆژانەدا کە لە ناوچەی سەرگەلو، یەکێتی نیشتمانی هێزەکانی خۆی کۆکردبووە بۆ شەڕی (پارتی) هەڤالانی ئێمە و برایانی حزبی شیوعی جهودیان سەرف کرد بۆ ئەوەی شەڕو لێك دان نەبێت و وەزعەکە هێمن بکەنەوە. خۆ ئەگەر ئێمە نیازی ئەڕ فرۆشتن و تۆڵەسەندنەوەی عەشایەریانەمان هەبوایە، زۆر دەرفەتمان بۆ ڕەخساوە کە لەڕێگای بەکار هێنانی



لایەنەکانی جود لە ئێمە زیاتر هەراسان بوون لە هەڵویستە چەوتەکانی یەکێتی نیشتمانی. بەلام هەموو لایەك ڕێگای دان بەخودا گرتن و پشوو درێژی و بێدەنگیمان هەڵبژاردوە، وە هەڵویستی نەرمی حزبمان جێگای ڕەخنەی چەندین لایەنی هاوپەیمان و جێگای تقدیری هەندی لایەنی تر بووە.

٦ـ لەبەر ئەو ڕوشنایی ئەو ڕاستیانەی سەرەوە هەموو لایەك گەیشتوتە ئەو قەناعەتەی کە یەکێتی نیشتمانی ئەگەر دڵسۆز بێت بۆ ئەو دروشمانەی بەرزی کردوتەوە، هیچ بیانویەکی بەدەستەوە نەماوە کە پەلاماری حزبمان بدات. چونکە ئەوەی کە جێگای سەرنجە زۆر لە برایانی لێپرسراوی بەرزی یەکێتی نیشتمانی لە کۆبونەوە و نەدوەکانیاندا باسی ئەوەیان کردوە کە وا لەگەل ڕژیم ڕێك ئەکەون بەلام چەکدارەکانیان هەر لە شاخ ئەمیننەوە.

برایانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەم جارە لە شاراوەنانەوە و برو بیانو دروست کردن بۆ بەرپاکردنی شەڕ، شیوەیەکی تازەیان گرتوتە بەر و خۆیان بە ستەملێکراو پیشان داوە و ئەم جارە بە ناوی پەکخستنی پلانی شەڕی براکوژی و کوردانەدنی شەرەوە، دەیانەوی کوردستان بکەنەوە مەیدانی شەڕو لێکدان. بیانویا



گۆڕاوە، بەلام مەبەست هەر وەکو خۆیەتی. وەکو ئەوەیان لەبیر چوبێت کە لە ماوەی شەش ساڵی ڕابردوو بیرو ڕاو لێکدانەوەو هەڵسەنگاندن و بۆچوونە سیاسیەکانیان کە لە چاپەمەنیەکانیاندا تۆمار کراوە. وە ڕەفتارو کردارو هەڵویستەکانیان هەمووی بۆ حەلال کردنی شەڕی براکوژی بووە و بە شانازیەوە لەگەل هەموو لایەکیان کردوە وە هیچ کاتێك گوێیان بەڕای گشتی جەماوەری کوردستان و هێزە سیاسیەکانی تر نەداوە، چەندین جار هەر لەبەر ئەوە پەلاماری هەڤالانی ئێمەیان داوە چونکە ووشەی شەڕی براکوژیمان بەکار هێناوە. ئێستاش چەندین بەلگەی دەستنوسی لێپرسراوانی یەکێتیمان لایە کە پریەتی لە هەراسانی و قەلس لە حزبمان چونکە بڕوای بە شەڕی براکوژی نەبووە و لەناو کۆمەلانی خەلکدا ڕیسوای بەدناوی کردوە و بەکاریکی زیان بەخشی داوەتە قەلەم. بێگومان ئەم مەبەستە ڕای بەماوەیەکی پێش بووە.

برایانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان وای تێگەیشتون کەوا بەگۆڕینی قسەو تاکتیکی ڕۆژانەیان هەموو ڕەفتارو کردەوەکانی ڕابردویان ئەسڕدرێتەوە و هەموو ڕاستەقینە مێژوویی و مەوزوعیەکان ئەگۆڕین، وەکو خەلکی کوردستان هیچیان نەدیبێت و گوێیان لە هیچ نەبوبێت و لە ناو



ڕوودا وەکاندا نەژیابن. هەلەو کەموکوری سیاسی بەڕاکردن و خۆگیل کردن لە ڕابردوو چارەسەر ناکرێن، وە بەوەش چارەسەر ناکرێن کەوا بەسەر لایەنی ترا بسەپێنرێن بەڵکو هەڵویستی شۆڕشگێری هەر حزبێك ئەوەیە بە جورئەتەوە بەچاوی ڕەخنەگرانەوە بەخۆیدا بچێتەوە و هەلەو کەموکوریەکانی دەست نیشان بکات و بێ باکانە باسیان بکات و دووبارەیان نەکاتەوە.

بۆ برایانی یەکێتی نیشتمانی واباشتر بوو کەوا سەرەتای شەڕی براکوژی کەوا لە ڕابردودا پەیڕەویان کردوە بۆ نەهێشتنی ناحەزە سیاسیەکانیان بەتوندی ڕیسوای بکەن و تاوانباری بکەن ....

بەلام برایانی سەرکردایەتی یەکێتی لەجیاتی ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوە و بەجدی بۆ هۆیەکانی شەڕی براکوژی بگەڕێن لە خۆیاندا و ئەیان هێلن، کەچی بە سوك و ئاسانی و زۆر بەسادەیی دەستی چەوری خۆیان بە ئێمە هەلسووە و خۆیان کردوە بە دلسوزی برایەتی و تەبایی و تاوانی ئەڕ فرۆشتنیان داوەتە پال سەرکردایەتی حزبمان و بۆ ئەو مەبەستەش چەند ڕوداویکی دروست کراوی بێ ئەساس و چەند ڕوداویکی شیوێنراویان بەئاوەژوو و بە بەڵگە هێناوەتەوە کە لە دوایدا باسیان ئەکەین و بەبەلگەی زیندوو ڕاستەقینەکان ئەخەینە ڕوو.

براياني سەركردايەتي يەكيتي نيشتماني كوردستان لە بەياننامەكە ياندا بەلين ئەركەكاني سەرشاني خومان پاش وەستاندني شەري سالي پار بەوپەري پەروش و دلسوزيەوە بەجي هيناوە . ديارە ليرەدا قسەكانيان ئاراستەي هەموو لايەنەكاني جود دەكەنەو لەبيانەوي واي لەرخەن كەوا لايەنەكاني جود ئەركەكاني سەرشاني خويان ئەنجام نەداوە بەلام بەشيوەيەكي تايبەتي ئەوەي پەيوەندي بە ئيمەو براياني يەكيتي نيشتماني هەبوو لە ريكەوتني ١٩٨٢/١١/٢٥ دا ئيمە هيچ كەموكوري و لادانو خودزينەوەيەك لە خومان شك نابەين بەپيچەوانەوە يەكيك لە خالەكاني ئەو ريكەوتنامەيە دابين كردني مافي ئازادي چالاكي سياسي و عەسكەري بوو لە كوردستاندا بو هەموو هيزەكان بەلام براياني يەكيتي نيشتماني كوردستان تا وەكو ئيستا لە ناوچەي قەرەداغ هەلويستي دوژمنانەيان هەيەو ناوچەكەيان قەدەغە كردووە و هەر كاتيك هيزەكاني ئيمە چوبنە ئەو ناوچەيە بەرەنگاريان بوو و شەريان لەگەلدا كردون بەپيچەوانەي ناوچەكاني دەشتي هەولير كە ئيمە ئازادي چالاكي نواندني هەموو لايەكمان نەبستەبەر كردووە و هيچ لايەك ريگاي لي نەگيراوە .

بەلام لە هەمووي سەيرتر ئەوەيە كە براياني يەكيتي نيشتماني كوردستان



دان بەراستەقينەيەكدا دەنين كە باتيك دەلين لەم قوناغە ميژوويەي ژياني گەلەكەمان كە هەلومەرجيكي لەبار لە مەيداني پيشمەرگەيي و سياسي و جەماوەري و ئيعلامي لەسەر ئاستي كوردستانو عيراقو ناوچەكەو جيهان بو خەباتي شورشگيرانەي گەلي كورد لە عيراقدا هەلكەوتووە كە بە هەنگاوي توند بەرەو سەركەوتن بچين بەلام هەندي دزو دەست رەش و گومان ليكراو لە سەركردەكاني حزبي سوسياليست هەولدەدەن بو لەبار چواندني ئەو دەرفەتەو هەلگيرساندنەوەي شەري براكوژي لە ريگاي خولقاندني روداوي دروست كراو و پەلپ و بيانوي ئاراستەوە .....

بەراستي دەمانەوي لەگەل براياني يەكيتي نيشتماني كوردستان هەنديك بەپەيوەروونتي و ئاشكرايي و وە بەبراييانە مناقشەي ئەو خالە بكەين وە لە رەخساني ئەو دەرفەتە لەبارە بو خەبتي گەلەكەمان لە ئەنجامي گورانەكاني ناوخوو رودداوە باەتيەكاني هاتوتە كايەوە... بەلام ئايا ئەوە ئيمەين يان ئيوەن ؟ كە ريگا نادەن سود لەو هەلومەرجە لەبارە وەربگيريت لە رووي پيشمەرگەيي و سياسي و جەماوەري و ئيعلامي ...

جەماوەري ميللەتەكەمانو هيزە نيشتمانيەكان شاهيدي رووداوەكانن



ئايا ئەوە حزبي سوسياليست بوو يان يەكيتي نيشتماني كەوا پيشمەرگەكاني لە سەنگەرەكاني خوارەوەي دژايەتي رژيم دەكيشاية دواوەو دووچاري شەري لايەني دەكردن . بيگومان بو ئەم راستيە بروامان وايە كە پيشمەرگەكاني يەكيتي نيشتماني خويشيان ناتوانن ئينكاري ئەوە بكەن .

حزبي سوسياليستي كوردستان لەم ماوەيەدا بە هەلويستي نەگوراوي شورشگيرانەي خوي بەردەوام بووە لە ئاراستە كردني زەبري كاريگەر لە دوژمني فاشيست و دامو دەزگاكاني .

ئايا حزبي سوسياليستي كوردستان يان يەكيتي نيشتماني كوردستان بووە كەوا پاشە كشيكردوە لە هەلويستي سياسي خوي لە رژيم و لە دروشمي ناوەندي خەبات .

ئيمە لەكاتيكدا بەرچاو روونانە سوور بووين لەسەر ئەوەي كە دوژمني سەرەكي گەلەكەمان لەم قوناغەدا رژيمي فاشي بەغدايە . بەلام ئايا ئيوە نەبوون كە وتنە گفتوگو كردن و پاساو هينانەوە بو سازش و گويزانەوەي مەيداني خەبات لە شاخەوە بو شار ؟

ئەوي ئەرشيوە نين، ئێ براياني يەكيتي نيشتماني كوردستان كە هەر مانگەي جاريك هيزەكانتان كودەكەنەوە بو بەگژا كردني ئيمە لا يان ئەو لايەنانە دوژمنە ستراتيجيە



تازەكانتان . ئيمە بووين ئوصولي رەفتاري دوستايەتي و هاوپەيمانيمان لەگەل دوستەكانمان پيشيل كردو لەپر پەلاماري بەشكري ئيسلامي هاوخەبات و هاوسەنگەرەكاني خرماندو قەتل و عامەمان كردن ئايا ئيمە لە دەستگاكاني راگەياندني خومان و بلاوكراوەكاندا پەلاماري هيزە نيشتمانيەكاني ترمان داوە .

ئايا ئيمە يان ئيوە هەنديك ناوچەيان بە قەدەغەكراوو داخراو لەبەردەم هيزەكاني تر هيشتوتەوەو

ئيمە بووين يان ليپرسراوەكاني ئيوە بوون كە گياني بەزاندنو رووخاندنيان لەناو جەماوەرو پيشمەرگە قارەمانەكاني كوردستان بلاودەكردەوە و كاتيك بو حەلال كردني سازش بلاويان دەكردەوە ( پيشمەرگە ماندووە) (صدام ناڕووخێ)(كورد هەقي چييە بەسەر عيراقەوە) (حوكمي ئيسلامي كە ديتە كايەوە لە صدام خراپترە) . لەوكاتەدا كە ئيوە بەوهەلويستانەتان وورەو حەماسەتي جەماوەرتان ساردەكردەوە. حزبي سوسياليستي كوردستان بە هەلويستي شورشگيرانەو مەعنەوياتي بەرزو بەرچاو روونتي تەواو تەموژي لەبەرچاوي گەلەكەمان دەتەراندو دەرسي فيداكاري و گيانبازي دەدايە دوژمنو مانورو پيلانەكاني ليي ريسوا دەكرد .

ئایا ئێمە یان برایانی یەکێتی نیشتمانی بەچاوی بێ بایەخی تەماشای خەباتی هێزە نیشتمانیەکانی ترمان کردووە وە بەردەوام پێشمەرگەو کادرەکانمان بە گیانی دژایەتی و ناحەزی هێزەکانی تر پەروەردە کردووەو هانمان داون کە شەڕی لایەنەکانی تر بکەن .

ئایا ئێمە ئیدعای دەسەڵاتداری کوردستانو مافی حاکمیەتمان کردووە یان برایانی یەکیەتی نیشتمانی .

ئەگەر برایانی یەکیەتی نیشتمانی بەراستی وەکو ووتویانە بەپەرۆش بوونایە بۆ سوود وەرگرتن لەو هەلومەرجە لەبارە هەرگیز وا ناموەزوعیانە راستیەکانیان نەدەشێواندو ئۆبالی ئەو وەزعەیان لە ئەستۆی خۆیاندا لانەدەداو فڕێیان نەدەدایە سەرحزبمان . ئەگەر ئەمەیان بۆ وازهێنان و پاشەکشێ لەو هەڵوێستانەی سەرەوەیان بێت خۆشە مە بەردەوام بوونە لەسەر هەلوێستی سیاسی چەوت بەلام بە شێوەیەکی تر . برایانی یەکیەتی نیشتمانی ئەوەیان کردووە بەعادەت هەر کاتێك لە باری سیاسیەوە شکست دەخۆن و هەڵوێست و بۆچوونەو تاکتیکە سیاسیەکانیان کە لە روانگەی تاککرەویەوە نەخشەی بۆ دەکێشن و بەروالەت هەلگەرانەوەیە لە هەڵوێستە سیاسیە ستراتیژیەکانیان



ئەنجامی ئەدات کە زیاتر بەتاق دەکەون و سەرلێشێواوی و نارەزایی دەکەوێتە ناو ریزەکانیانەوە ، بۆ داپۆشینی ئەو بارەیان تاکوکیەك لەگەل لایەنێك دروست دەکەن لە جیاتی ئەوەی راستی بە هێزەکانیان بڵێن بە کەسەر بەدوژمنێکی دروست کراو دەیان ترسێنن .

هەروەکو مەسەلە کوردیەکەی بەڵێ (تاکو ماخۆمال دزی گرت دز ماخۆمالی گرت) دیارە ئەمە لە ئێمەو برایانی یەکیتی قەوماوە . لەبەر ئەوە بە پێویستمانی ئەزانین بە رووناکی خستنە سەر راستیە بابەتیەکان پەیوەندی نێوان هەردوو لامان پیشان بدەین لە ماوەی پاش وەستاندنی شەرەکەی پاری یەکیتی لەگەل لایەنەکانی سەر گۆرەپانی خەبات بۆ ئەوەی باشتر دروو راستی بەهانەکەیان دەرکەوی .

پار ... تاکو ئێستا بخەینەروو بۆ ئەوەی راستی ناوەروکی بەهانەکەیان شی بکەینەوە

١) لە چەند نووسراو و یاداشتێکدا کە دوایەکەیان یاداشتی روژی ١٩٨٢/١/٢٢ بوو داوامان لە برایانی یەکیەتی نیشتمانی کردو (پیش وەستاندنی شەرو دوای وەستانی شەر) بۆ دانانی دادگایەکی هاوبەش بۆ محاکمە کردنی ئەو بکوژانەی کە هەڤالانی ئێمەیان شەهیدکردبوو وەلەلای یەکیەتی حەوێندرابوونەوەو ژمارەیان (٦) تاوانبار



بوو وە دووجاریش برایانی حزبی شیوعی عیراق بۆ ئەو مەبەستە راسپێردران کە لەگەل یەکیەتی نیشتمانیدا قسە بکەن کەچی ئیستاش ئەو بکوژانە ژمارەیەکیان ماونو دەوری مەسئولیەتیشیان هەیە .

٢) لە خالەکانی ریکەوتنی ١١/٢٥ دا تاکید لەسەر ئەوە کرایەوە کە ئیتر هیچ لایەنێك دەست نەخاتە ئیشوکاری ناوخۆی لایەنەکانی ترەوە بەلام برایانی سەرکردایەتی یەکیەتی نیشتمانی بێ ئەوەی گوی بدەنە ئەو خالە لەسەر سیاسەتی پیشویان بۆ دەست خستنە ناو ریزەکانی حزبمان بەردەوام بوون . ئەوەبوو چەند پیشمەرگەیەکمان هەندێ گیروگرفت و مشاکلیان هەبوو کە زیاتر پەیوەندی بە نەداری حزبەوە هەبوو . سەرکردایەتی یەکیەتی کەوتنە دلخۆشی دانەوەیان و چارەسەرکردنی گیروگرفتە مالیەکانیان و لەپاشان بەیانێکیان بە ناویان لە ئیستگەکەیان بلاوکردەوەو کەوتنە پروپاگندە کردن پییان لەدژی حزبمان . دیارە فریودانو راکێشانی پێشمەرگە لەسەر اساسی پارەوپوول کاریکی ناشۆرشگیریەو پیشمەرگە فێری هەلپەرستی و پارەپەرستی دەکات کە دوژمن لە ئەنجامدا سوودی لی وەردەگری .

٣) لەکوتایی مانگی ٣/٩٨٢ هەڤالیکی کادرمان بەناوی هیوا (مهدی) لە گوندی [illegible]



وەرتی لەلایەن چەکدارەکانی یەکیەتی نیشتمانی بەشەو شەهیدکرا ، چونکە روژی پیشوو موناقەشەی سیاسی لەگەل چەند کەسیکیان کردبوو .

٤) شازاد خوشناو کە یەکیك بوو لە کادرەکانی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان و لە ئەنجامی زنجیرەیەك گیروگرفتومشاکلی سیاسی لەو ماوەیەدا دووخزمی اعدام دەکرینو روژیك لە ئەنجامی مناقشەی سیاسی لەنیوان دا دەبیتە تەقەو لیکدان کادریکیان دەکوژری . پاشان شازاد خوشناو دەیەویت بروات تەسلیمی رژیم ببیتەوە بەلام کاتیك تووشی هیزەکانی ئیمە دەبیت و داوایان لی دەکات کەوا بیپاریزنو ئامادەیە بو محکمە . ئیمەش پیش ئەوەی شازاد خوشناو لای خومان وەربگرین بە نووسراوی ژمارە ١٢٠١ روژی ١٩٨٢/١/٢٢ یەکیتی نیشتمانی کوردستانمان ئاگادارکرد کەوا ئامادەین بو ئەوەی شازاد خوشناو لەلایەن دادگایەکی هاوبەش محاکمە بکری . بەلام برایانی یەکیەتی خویان بوارد .

[illegible] پیشمەرگەمان کە بەئیجازە چووبوونە [illegible] کەس کاریان لەلایەن چەکدارەکانی یەکیەتی نیشتمانیەوە لە روژی ١٩٨٢/٢/١٧ لە گوندی شاحە بیسکە چەکدەکرینو لە پاشان [illegible] بە ئامەردیەکیان بەناوی (جوهر محمد) شەهید دەکەنو ئەویتریش بەناوی ([illegible]

بە لوولە تفەنگ چاوی دەردەهێنن.

٦) لەکۆتایی مانگی ١٩٨٢/٥ دا ٣ پێشمەرگە لەگوندی قەشقە لەلایەن مەفرەزەیەکی سەر بەیەکیەتی نیشتمانی کوردستان کەمینیان لێ دانرابووەو شەهیدکران و بە نووسراوی ١٢٩٥ لە ١٩٨٢/٦/١٢ داوامان لە سەرکردایەتی یەکیەتی نیشتمانی کرد و چەند شاهێد و بەڵگەمان خستە بەردەست کە لێپرسراوی مەفرەزەکەیان سەربە مەبری بووەو نۆکەری عیبسی ئەم خواری خائن بووە هەرچەندە بە نووسراوی ٢٧٥/س رۆژی ١٩٨٢/٧/٧ بەڵێنیان دابێتی کەوا تاوانبارەکان لەرێگای دادگاوە بەسزا دەگەیەنن بەڵام بەداخەوە هەر قسە بوو.

٧) لە هاوینی رابووردوودا کاتێک مەفرەزەیەکی هەرێمی ٥ی شارەزوورمان دەیەویست بچێتە قەرەداغ بۆ سەردانی خزم و کەسوکاریان لەرۆژی ١٩٨٢/٧/١٠ لەگوندی (نەمەل) لەلایەن هێزەکانی یەکیەتی دەوریان دەگیرێ و تەقەیان لێ دەکرێ لە ئەنجامدا پێشمەرگەیەکمان بەناوی (سلێمان تلەزەیتی) شەهید دەکەن و یەکێکی تریش بریندار و یەکێکیش بە دیل دەگرن.

٨) لەرۆژی ١٩٨٢/٨/١١ پێشمەرگەیەکی حزبمان بەناوی حمە کانە گەرمیانی لەلایەن چەکدارەکانی یەکیەتی نیشتمانی چوانەگرێت



٩) لەرۆژانی ٢٤-١٩٨٢/٧/٢٥ لەدەشتی کۆیە لەلایەن دوو لێپرسراوی یەکیەتی نیشتمانی بەناوی شێخ شەمال و سەرباز کەمین بۆ هەڤالانی هەرێمی ٥مان دادەنێنەوە بەڵام هاونیشتمانی ناوچەکە خەبەر دەدەن بە پێشمەرگەکانی حزبمان و ناهێڵن بکەونە کەمینەکەوە.

١٠) نزیکەی دوومانگ پێش ئێستا پێشمەرگەیەکی هەرێمی ٥مان بەناوی ئازاد ظاهر لەگەڵ ژمارەیەک چەکداری یەکیەتی لە گوندێکی دەشتی کۆیە دەکەوێتە مناقشەی سیاسی چەکدارەکانی یەکیەتی کاتێک ناتوانن لە مناقشەکەدا خۆ رابگرن گورج پەلاماری دەدەن وەچەکی دەکەن.

١١) لەرۆژی ١٩٨٣/١/٢٢ کاتێک مەفرەزەیەکی قارەمانی هەرێمی ٥مان بەلێپرسراویەتی هەڤال کاکە سوور چەند دەست وەشاندنێکی قارەمانانە ئەنجام دەدات دژی رژێم و لە گەڕانەوەدا لەلایەن چەکدارەکانی یەکیەتی کە لێپرسراوەکانیان (شێخ شەمال و سەرباز) بوون بەناوی دۆستایەتی و ناسیاوی دەوریان دەگیرێ و چەک دەکرێن و لێپرسراوەکەشیان کە هەڤال کاکە سوورە بەبەندی رەوانەی ناوزەنگ دەکرێ و ئێستاش بەندە لایان و هەرەشەی کوشتنیشی لێ کراوە.

سەرکردایەتی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان



لە بەیاننامەکەیاندا چەند رووداوێکی هەڵبەستراو و دروست کراویان باس کردبوو کە گوایە پێشمەرگە قارەمانەکانی ئێمە کردوویانە. هەروەها چەند رووداوێکیشیان بە ئاوەژوو ئیوپێنراو تێکەڵاوکردبوون کە بەقەد ئەرز و ئاسمان لە واقیعەوە دوورن. بۆیە بە پێویستمان زانی کەوا مناقشەیان بکەین.

١) باسی مەوزوعی تەقە کردن لە دولەرەقە لە (عمر حاجی ابراهیم) دەکەن کەگوایە پێشمەرگەی ئێمە بە ئاریبی جی چوونەتە سەری وە تەقەیان لێ کردووە- سەبارەت بەو رووداوە کە خەڵکی دولەرەقەو پێشمەرگەو هەموو جەماوەری کوردستان باش دەزانن کەوا عمر حاجی ابراهیم تاوانبارێکە و بەشداربووە لە شەهیدکردنی ٨ پێشمەرگەی دیلی حزبمان ئەگەر ئێمە بڕوامان بە انتقامی عەشایەرانە هەبێت پاکمان نییەو مافی خۆمانەو بەئاشکرا و اعلانیشی دەکەین. بەڵام راستییەکەی کە هەوڵ دراوە بشارێتەوە ئەوەیە ناوبراو لەلایەن یەکێک لە مەسئولەکانی خۆیان کەناوی (شێخ هومەر) بوو تەقەی لێکراوە و هیچ پەیوەندیەکی بەحزبمانەوە نییە. ئەم راستییە لەخۆشیان و لەهەموو کەسیش روونە.

٢) باسی ئەوە دەکەن کەگوایە لە کومتەیان کەمینیان بۆ دانراوە. ئەو رووداوە هاوری-



یانی حزبی شیوعی ئاگاداربوون کاتێک کە مەفرەزەیەکی حزبمان میوانی رەشماڵێکی رەوەندەکان بوون و بۆ چارەسەرکردنی کێشەی لەوەڕوپاوانی رەوەندەکان دەچنە ئەوێ. لەوکاتە سەیارەیەکی پڕلەپێشمەرگە لە کومتانەوە دێت و نزیک رەشماڵەکە دەوەستێ و چەند پێشمەرگەیەکی لێ دادەبەزێ وە یەکسەر رادەکەن بەرەو شاخەکەو دەست دەکەن بەتەقە کردن. پاش ماوەیەک بیستمان کەوا (علی نبی) ناوێکی تێدا بووەو ناوبراو لەخۆی بەگومان بووەو وا تێگەیشتووە کە پێشمەرگەکان بەتایبەتی بۆ ئەو چوونەتە سەر جادەو نیازی خراپیان لەگەڵیدا هەیە.

٣) باسی بەچکە ئاغایەک دەکەن کە گوایە لە جاشەتی گەڕاوەتەوە و پاشان پ.م مەلا حسنی شەهید کردووە. بەراستی پێمان خۆش نەبوو باسی بەچکە ئاغا بکەن چونکە کورد گوتەنی یەکێک مالی سەرتاپا لە شووشە بێت هەق نییە بەرد بگرێتە پەنجەرەی خەڵکی تر. ئەم مەوزوعە خەڵکی کوردستان و هێزە نیشتمانییەکان باش دەیزانن ئاخۆ دەرەبەگ و بەچکە ئاغاو کەسانی گەڕاوە لە جاشیەتی و خیانەت روو لە چ لایەک دەکەن و ئێستا موقعیان لەکوێیە. بەڵام دەربارەی ئەو بەچکە ئاغایەی باسیان کردووە دووساڵ و نیو پێشمەرگە بووە لای خۆیان و هەر لای خۆشیانەوە هاتوتە پاڵ ریزەکانی حزبمانەوە

ڕاستی ڕوودا وەکەش لە قوڵڵەی کانی ماران بووەو خەڵکی گوندەکەش هەموویان مناون و نزیکیش لە هەموولایەکەوەو بە ئاسانی دەتوانری لێکۆڵینەوە بکری و ڕاستییەکەش بۆ هەموو لایەک معلومە تەنانەت هەتا بۆ برایانی سەرکردایەتی یەکیتیش بەلام قەرەنی لەگەڵ مەفرەزەیەکی ١٠ کەسی کاتێک لە چیتە نە گوندی قوڵڵەیکانی ماران ملاحسنی ملارەش لەگەڵ ٣ پێشمەرگە لە مزگەوتی گوندەکە دەبن . ئەمانیش بوخۆیان لە ماڵێک دادەنرێن بۆ نان خواردن لە دوایدا لەلایەن مەلای ڕەش داوایان لێ دەکرێ بۆ کۆبوونەوە بۆ باس کردنی مەوزوعی چەکی چەند پێشمەرگەیەک کە چەند ڕۆژی پێش لە لای مەلاوە چوونەتە لای قرنی . بەلام بۆ ئەم مەبەستە قرنی وەلام دەداتەوە کە مەوزوعی چەک لە سەرکردایەتی دەبێت چارەسەر ناکرێت چونکە مەوزوعێکی ئاڵۆز وتێکەڵاوە . پاشان لەسەر ئیحاحی لێپرسراوی برایانی یەکیەتی لە شوێنێکی محاید دادەنیشن و خەڵکی گوندەکەش بەشدار دەبن و لە ئەنجامدا تفاهم دەکەن کە هەردوو لایان نامە بۆ سەرکردایەتی خۆیان بنووسن بە ئتجاهی تفاهم و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکە لەوکاتەدا یەکێک لە پێشمەرگەکانی سەربە برایانی یەکیەتی دەست دەکات بە هەڕەشەو قسەکردن و مەوزوعەکە دەکاتە هی خۆی و دەست دەبات بۆ چەک و دەبێتە تەقە . لە ئەنجامدا



دوو پێشمەرگەی ئێمەو دوو پێشمەرگەی برایانی یەکیەتی شەهید دەبن و یەکێکی خەڵکی گوندەکەش شەهید دەبێت . ئێمە بە بیستنی هەواڵەکە زۆر نارەحەت بووین و خۆمان داوای لێکۆڵینەوەو تحقیقمان کرد بەلام برایانی یەکیەتی وەختێک کەوا هەستیان کرد کەوا برادەری ئەوان دەستپێشکەر بووەو لێکۆڵینەوە لە بەرژەوەندیان نیەو خۆیان لێ بوارد .

٤) دەربارەی ڕوداوی عازەبان برایانی یەکیەتی باسیان کردوە ، کەوا ئەو تاوانە لە دژی ئەوان کراوە ... بەلام ڕاستیەکەی ئەو تاوانە دژی حزبمان کراوەو لەلایەن خائن ڕووف زەرایەنی و بۆ میری کراوەو ناوبراو ئێستا جاشی میریە ...

٥) دەربارەی ئازاد خۆشناو هەروەکو لە بەیانەکەدا ئیعتراف دەکەن کەوا ئێمە داوای لێکۆڵینەوەمان کرد بەلام ئەوان لەسەر ئەوەی کە گوایە ناوبراو فەرمانی کوشتنی بۆ دەرچووە لەلایەن پێشمەرگەکانیانەوە دادگای شۆڕشگێری دەکرێ . خستیانە پشت بەلام پاش ئەوە چەند نووسراوێکی لێپرسراوەکانیان لامانە کە بە ئازاد خۆشناویان ناردووە داوای گەڕانەوەی دەکەن کە بچێتەوە لایان و ناوبراو بە پاك و دڵسۆز دەدەنە قەڵەم .

٦) باسی ڕوداوی دەشتی هەولێر دەکەن



بەلام نەیانوێراوە مێژووەکەی بنوسن . بەڵێ بەگوێرەی معلوماتێک کە پێمان گەیشتوە لە کۆمیتەی سەرکردایەتی هەولێرەوە پێشمەرگەکانی هەرێمی (١٥) کە لە دەشتی کۆیە ڕۆژی ١١/٢٢ دا مەفرەزەیەکی ١٢ پێشمەرگەییان بە دەستی چەکدارەکانی یەکیتی چەك دەکرێن . وە لە ڕۆژی ١١/٢٨دا وەکو کاردانەوەیەکی ئەو کارە ناشۆڕشگێڕیەی دژیان کراوە بەبێ فەرمانی سەرکردایەتی مەفرەزەیەکی سەر بە یەکیتی نیشتمانی چەك دەکەن کە ژمارەیان ٧ کەس بوون و لێپرسراوی مەفرەزەکەش بە بارمتە دەگرن ، لە بەر سەلامەتی ژیانی هەڤال کاکە سور کە بە هەڕەشەی کوشتنەوە ڕەوانەی سەرکردایەتی خۆیان کردوە وە ئێستا لەوێ بەندە .

٧) دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی گوندەکان کە لە یەك لایەنی لەلایەن برادەرانی یەکیتی نیشتمانی کوردستان بە شێوەی دانان و تعیین نەك هەڵبژاردن لە گوندەکاندا وەکو پەیڕەوی کردن لە گیانی دەسەلاتداری دانەنرێت . هەڤالانی ئێمەو حزبی شیوعی و پاسوك پێمان قابیل نەبووین وە داوامان ئەوە بوو کە بە هەڵبژاردن لە لایەن دانیشتوانی گوندەکانەوە بێت بەبێ دەست تێوەردان و خۆ فەرز کردنی هیچ لایەك لە ئەنجامدا فەرمانەی مەلبەندی دووەمی سەر بە یەکیتی لەگەڵ نوێنەرانی



حزبمان و حزبی شیوعی لە گوندی مالومە کۆبوونەوە دەکەن و پاش مناقشە هەڤالان بڕوویان قبول مەبدەئی بە هەڵبژاردنیان بە چەند دەکا زۆریکە وتنامەیەکیش بۆ ئەو مەبەستە ئیمزا دەکەن .

جەماوەری خەڵکی کوردستانی شۆڕشگێڕ .. برایانی یەکیتی نیشتمانی کوردستان لە بەیانەکەیاندا زاتی ئەوەیان نەکردوە کە باسی هۆیە ڕاستەقینەکانی ناتەبایی و شەڕو ئاژاوەو گیروگرفتەکانی ئەم چەند ساڵەی نێوان پاڵەکانی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی بکەن چونکە دڵسوزو جدی نین بۆ نەهێشتنی ئەو بارە ناڵەبارەی کە هەر تەنها دوژمن سوودی لێ وەرگرتوە . بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە کەوا بە شێوەیەکی تاکتیکی و بە ڕواڵەت لێپرسراویەتی ئەو وەزعە ناوخۆیە لەسەر خۆیان لابەن .

بۆیە ئێمە لێرەدا کە زۆر مەبەستمانە و دڵسۆزانە لە هەوڵی نەهێشتنی ئەو وەزعەو دابین کردنی زەمینەیەکی گونجاو بۆ پەیوەندیەکانی نیشتمانی و مسوگەرکردنی هاوخەباتی ڕاستەقینە دژی ڕژێمی فاشی و لە پێناو دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی ئیئتلافی وئوتونومی ڕاستەقینەدا بە پێویستی دەزانین هۆیە بنچینەییەکانی شەڕی برا کوژی و ئاژاوەی ناوخۆ باس بکەین و هەموو لایەك پێکەوە هەوڵی

لایەلاکردنەو نەهێشتنیان بکەین بە خەباتی یەکگرتووی جەماوەری گەلەکەمان و هێزە نیشتمانییەکانی ؛ تاکو ئیرادەی خۆمان فەرز بکەین لە باشترین شێوەی ژیانی دیموکراتیدا .

١- بوونی جیاوازی بیروڕا و خیلافی سیاسی لە نێوان هێزە نیشتمانییەکاندا کە ئەمەش شتێکی سروشتییە لە جەوی ئاسایی و دیموکراتیا و کاری هێز و ئیجابییە . بەلام شێوەی تێگەیشتن و ڕەفتار لەگەڵ کردنی لە حزبێکەوە دەگۆڕێت بۆ حزبێکی تر . ئێمە لەگەڵ برایانی یەکێتی نیشتمانی لە ڕووی فکری و سیاسییەوە جیاوازیمان هەیە هەر وەکو لەگەڵ برایانی حزبی شیوعی و پاسۆک و پارتیش هەمانە . بەلام زۆر خاڵی هاوبەشیشمان هەیە و لە سەر مەسەلەی ئەساس کە ئەویش ڕووخاندنی ڕژێم و دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی و هێنانەدی ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کوردستان خیلافمان نییە . بۆیە ئێمە گیروگرفت و خلافەکانی تر لەم قوناغەدا بە شتێکی لاوەکی و خیلافاتی ناو ڕیزەکانی گەل دەزانین کە دەبێ بە ڕێو شوێنی دیموکراتیانە و تووێژی برایانە چارەسەر بکرێن . هیچ کاتێک لە تەحلیل و هەڵسەنگاندنەکانی یەکێتی نیشتمانیمان بە هێزێکی دوژمن و نانیشتمانی دانەناوە ، کەوا بوو نەمافمان بە خۆمان



داوە و نە پێشمەرگە و کادرەکانمان فێر کردووە بە چاوی دوژمنایەتی سەیریان بکەین و ڕەفتاریان لەگەڵا بکەین. بە پێچەوانەوە هەوڵی دامەزراندنی پەیوەندی دۆستایەتی و هاوخەباتیمان داوە لەگەڵیان ئەمەش کۆنگرەی یەکەمی حزبمان بڕیاری داوە. بەلام برایانی یەکێتی نیشتمانی لە هەڵسەنگاندنەکانیان زۆر جار ئێمە و لایەنەکانی تریان لە خانەی دوژمنان و دەرەوەی ڕیزی نیشتمانی داناوە . ئەم بۆچوون و هەڵسەنگاندنە چەوتانەش ڕایانکێشاون بۆ ئەوەی ڕەفتاری دوژمنانەمان لەگەڵدا بکەن . وەکو لە نامیلکەی (جۆش و خرۆشی خەبات) و نامیلکەی (یەکێتی نیشتمانی بۆچی)دا دەردەکەوێ .

٢- کەڵکەڵەی تاکە حزبی و حزبی سەرکردە : ئێمە زۆر جار تاکیدمان کردۆتەوە و بە ڕەفتاری ڕۆژانەش سەلماندوومانە کە خۆمان بە باڵێکی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد دەزانین و ڕێزیش بۆ خەباتی هەموو لایەنە کوردستانییەکان دادەنێین و حەز بە برایەتی و هاوخەباتیان دەکەین و لەگەڵ چەند لایەنێکیان لە ناو (جود)دا باشترین پەیوەندی برایانە و هاوخەباتیمان هەیە . وە ساحەی کوردستان بە مەڵبەندی خەباتی هەموو نیشتمانپەروەران و تێکۆشەرانی کورد دەزانین و بە چاوی سووک تەماشای هیچ



ڕێکخراوێک ناکەین . بەلام برایانی یەکێتی نیشتمانی وەکو لە بیرکردنەوەی سیاسی و هەڵوێستیاندا دەبینری خۆیان بە تاکە حزب و تاکە سواری مەیدان دەزانن و بە چاوی بێبایەخی و سووکییەوە تەماشای هێزە کوردییەکانی تر دەکەن و لە شوێنانەی بۆچوونیان ڕێگای چالاکی لایەنەکانی تر دەبەستن و بڕوایان بە گیانی دیموکراتی و بەرەیی زۆر لاوازە و تەنها حسابی هێز و دەسەڵاتی زۆر دەکەن .

٣- پاشماوەی دوژمنایەتی مێژووی کۆن : ئێمە وەکو حزبی سۆسیالیستی کوردستان کە خۆمان بە حزبێکی نوێ و هەڵگری بیروباوەڕی سۆسیالیستی زانستی دەزانین ، هەر لە سەرەتاوە ڕامان گەیاندوە کەوا ئێمە خۆمان بە میراتگری لایەنە سلبییەکانی کۆنی شۆڕشی ئەیلوول و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد نازانین و بە چاوێکی زانستیانە و مەوزوعیانە بۆ دەرس وەرگرتن نەک بۆ تانە و لۆمە ، باسی هەڵە و لادان و تەجروبە دژوارەکانی ڕابوردوو دەکەین .

٤- بوونی تەئسیری دەرەوە و سیاسەتی مەحوەرەکان: ئەمەش زۆر جار تەئسیری خۆی هەیە ، حزبمان کە ئیستقلالییەتی خۆی بە هەموو نرخێک پاراستووە هیچ کاتێک خۆی تێکەڵاوی میحوەرەکانی دەرەوە پشت نەکردوە .

٥- جێگابوونەوەی دەست و تاقمی خاوەن بەرژەوەندی تایبەتی یان گومان لێکراو



لە ناو ڕیزەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کە بە هەموو شێوەیەک هەوڵ دەدەن ئاڵۆزی و ئاشووبی بلاوبکەنەوە و لە خیلافاتی حزبەکان کەڵک وەربگرن و بەرژەوەندییەکانی خۆیان بپارێزن و نەخشە گڵاوەکانی دوژمن جێبەجێ بکەن . ئێمە لێرەدا ئەم خاڵە بۆ جەماوەری کوردستان بەجێ دێلین کەوا حوکمی دادپەروەرانەی خۆیان بەسەردا بدەن .

برایانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەگەر جدی بن و بە دڵسۆزییەوە بیانەوێ بۆ زەمینەی برایەتی و هاوکاری لەگەڵ هێزە نیشتمانییەکان بگەڕێن ، دەبێ بە جورئەتی شۆڕشگێڕانە ئەو ڕوحییەتە و بیرکردنەوە و بۆچوونە سیاسیانەی سەرەوە بدەنە تیشکی بیروباوەڕی زانستی و بە چاوی ڕەخنەگرانەی مەوزوعییەوە هەڵوێستیانی دیاری بکەن .

هاونیشتمانانی بەڕێز :

ئێمە لە کاتێکدا ئەو ڕاستییانەی سەرەوە باس دەکەین مەبەستمان نییە ئاڵۆزی زیاد بکەین و لایەنی تەباهی بەلاوە بنێین بەڵکو زیاتر لە بە پەرۆشی و هەست کردن بە مەسئولیەتی مێژوویمانە بۆ ئەوەی نەخۆشییەکانمان و هۆیەکانی و شێوەی چارەسەرکردنیان بدۆزینەوە و زەمینەیەکی پتەو دابین بکەین بۆ خەباتی یەکگرتووی هێزە نیشتمانییەکانی کوردستانی و عێراقی .